# ماجەرای
# دختۆر کاکۆی سەگەوان

عەبدولرەحمان فەرهادی





ناوی کتێب: ماجەرای دختۆر کاکۆی سەگەوان
بابەت: چیرۆک و تەنزە چیرۆکی یادەوەری.
نووسینی: عەبدولڕەحمان فەرهادی.
پۆرتریتی بەرگ: عەلی مەندەلاوی.
دیزاینی بەرگ: باسم ڕەسام.
دیزاینی ناوەوە: عوسمان پیرداود.
پیتچنین: نووسەر.
هەڵەگر: هیڤی عەبدولڕەحمان فەرهادی.
چاپخانەی: تاران
تیراژ: ١٠٠٠ دانە.
نۆبەتی چاپ: یەکەم (٢٠٢٠).
بایی: ٣٠٠٠ دینارە.
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان،
ژمارە (٩٢)ی ٢٠٢٠ی پێ سپێردراوە.

جاران لەو دەڤەر و ئاخ و وارەی مە، ئەگەر منداڵێک لە دایک بووبا، هێشتا هەفتەی نەدەچوو خزم و کەسوکار و دەر و دراوسێ و ئاشنا و ڕۆشنا بانگهێشت دەکران و لێک خڕدەبوونەوە و شەودانیشتنێکی خۆش و بە تام و خوێ تا درەنگانێکی شەوێ ساز دەکرا، ئەمە جگە لە مەلای ئاوایی کە نانی ئێوارێی هەر لەو ماڵە دەخوارد کە ئەو حەشاماتەی لێ خڕدەبۆوە، زۆری نەدەبرد، هەروا دوای خواردنەوەی گەڕەچایەکی دیشلەمەی گەرموگوڕ، منداڵەیان بە مەلۆتکەکراوی دەهێنا و لەسەر بێژنگێکی گەورەی دەمەونخوون کراو لەبەردەمی مامۆستایان دادەنا و ئەویش بانگی ناولێنانێی بەگوێدا هەڵدەدا و منداڵەیان بەو ناوەوە ناوزەد دەکرد کە پێشتر بۆی دەستنیشان و دیاری کرابوو و ئیدی بەو جۆرە منداڵە ساواکە دەبووە خاوەن ناو و نیشان و ناسنامەی پێناسینەوەی خۆی و پێی دەناسرایەوە. بەڵام ئەوەی لە من قەوما یاخوا لە کەس نەقەومێ، وەختێکی ئەو کۆمەڵە بابەت و نووسینانەی سەیدا عەبدوڕەحمان فەرهادی م بە ناوونیشانی ( ماجەرای دختۆر کاکۆی سەگەوان) بەر لە چاپدانیان خوێندەوە و بە نێو کەلێن و پێچ و پەنا و هەوراز و نشێو و هەڵەتی ناوەرۆک و

بابـەت و مانـا و مەبەسـتەکانی کەوتـم، بـە واقـی ورەوە دەسـتێکم کەوتـە ئەمـلا و ئـەوی دیکەشـم کەوتـە ئـەولا و دەسـتە وەسـتان تێمـام، خودایـە ئەو جۆرە شێواز و نووسینە و ئەو ناوونیشـان و بابەتانـە ناچنـە نـاو جوغـزی هیـچ جـۆرە ژانرێکـەوە و هیـچ جـۆرە ناوێـک بـە بانـگ و سـەڵای هیـچ مەلایەکیش بەخـۆ ناگرن، ئاخـر باشـە نە شـیعرە و نـە چیرۆک، نـە نۆڤلێتـە و نـە ڕۆمـان، نـە پەخشـانی هونـەری، ئـەدی ئـەو دەعەجانـە تـازە لـە دایکبـووەی نـاو وێژە و ئەدەبی کوردییـە دەبێ چبێ..؟! لـە هـەر لایەکـەوە پارێزی دەبەمێ خۆی بـە دەسـتەوە نـادا، نـە تەنـزە و نـە سـاتیر نـە جەفەنگـە و نـە گاڵتـە و گـەپ و قەشـمەری و نـە جـۆک، کەچـی کـە تێشـی هەڵدەڕوانـی و لێـی ورد دەبیـەوە و تێـی ڕادەمێنـی ئاوێنەیەکـی بـاڵا نمـای هێندەی بەژنـە پیاوێـک بڵنـدە و هەرچـی عەیـب و عـار و خـوار و خێچـی و لینگـە و قوچـی مرۆڤـە ناقۆڵایـە خـۆ بـە زلـزان و دانـا و زاناکانـی ڕێـزی پێشـەوەی زۆر جێـی نەشـیاون، هـەر دەڵێـی وێنـەی فۆتۆگرافیـن و لـەو ئاوێنەیـەوە خـۆ دەنوێنـن و سـەرەتاتکێ لەگـەڵ خاوەنەکانیـان و خەڵکـی ئـەو دەوروبـەرەی خۆیـان دەکـەن و نـاو و ناوبانـگ و ناسـنامە درۆزنانـە دەمامکدراوەکانیـان ئاشـکرا دەکـەن.

خودایە بە دوورمان کەی لەو شتە سەیرە تازە لە دایکبووەی ئەم سەردەم و زەمانە و نەکەوینە بەر دەم و زمان و چنگ و نینۆکی ئەو دەعەجانە عاجباتییە و خوا بکا مام مۆتکێکیشی لێ پەیدا بێ و ناوێکی پڕ بە پێستی خۆشی لێ بنێ و بانگی بە گوێدا هەڵدا.

**غەریب پشدەری**

**٢٠١٩/١٢/٢ - هەولێر**

# جوانەگای قەش

غانم ئەڵڵاوێردی شارستانییەکی دەوڵەمەندی هەولێر بوو، جەژنی قوربان لە نزیکبوونەوەدا بوو، حاجی غانم، نوورەدین قەسابی ڕاسپارد بۆ جەژن جوانەگایەکی خرتی لە دابەستەکانی خۆی بۆ قوربانی بۆ بێنێتە ماڵەوە، تا بۆ ڕۆژی دووەمی جەژن بە خێرات هۆقە هۆقە بەسەر نەدار و بێ بژێوان بیبەشێتەوە. سمایلە کەشخە، یەکێک بوو لە جەڵەبەوانە ناسراوەکانی مەیدانی حەیوانان، کە سبەینان لەگەڵ زەڕڕەی نێرەکەرێ تا نوێژی نیوەڕۆ لەوێ دەبوو، شەوی پێشتر سمایل ئاگادار کرابووەوە کە حاجی غانم دابەستەیەکی بۆ قوربانی دەوێ و لێی مەعلووم بوو بۆ هەندێ، ڕوو لەو دەکەن، بۆیە ئەو ڕۆژە چەند دابەستەیەکی کەتەی زەلام زەلامی هێنابووە مەیدانێ.

نوورەدین قەساب بەخۆی و چەند شاگردە چەپرچاخ لە پشتێکی، کە شێمەشیان لەگەڵدا

بوو، ڕوویان کردە مەیدانی حەیوانان کە ئەوکات کەوتبووە چۆلایی تەنیشت بەڕێوەبەرایەتیی ئەشغالی هەولێر، ئێستا ئەوێ بووەتە گەڕەکێکی خواپێداوان لە ناوەوەی شەست مەتریی لای خۆرئاوای باکووری منارەی چۆلی کە خەڵکەکەی زۆرینەیان ئاغەواتی دزەییانن، نوورەدین و جەماعەتەکەی، بۆ نیوەڕۆکەی لەگەڵ سمایلە کەشخە پێکهاتن و دابەستەیەکی جوانەگای قەشی کەپوو پڕ مشوهۆڕیان بەگەڵەخۆیاندا تا لە سیفەکەی برایماغا بیبەستنەوە، پێشتر نوورەدین بە ئاگاداریی حاجی غانم، ئیزنی لە دەستوپێوەندەکانی برایماغا لەوانە مەولوود نۆغەرانی و حووجانە کتوکۆر وەرگرتبوو، بۆ ئەوەی جوانەگاکە لەوێ بێت تا بۆ دووەمین ڕۆژی جەژنێ یخیکەن و گۆشتەکەی حەلالی ئەو عالەموڵڵایەی بکەن.

سبەینەکەی دووەمین ڕۆژی جەژن شێمە و شاگردەکانی نوورەدین قەساب، بەرەو سیفەکەی برایماغا کەوتنە ڕێ و دوای دە خولەکێک گەیشتنە لای جوانەگا و خەریکی کردنەوەی گرێکوێرەی کندرە ئەستوورەکەی جوانەگاکە بوون، شێمە ئارەقەی ڕەشوشینی دەردابوو، گرێ بە چ کوللوبابەتێ نەدەکرایەوە و نەدەکرایەوە، تا

نوورەدیـن خـۆی نەهـات و بـە چەپرچاغەکـەی کندرەکـەی نەپسـاند هیچیـان پـێ نەکـرا، هـەر هەنـدە گوریس قـوت بـوو، جوانـەگای قەش خۆی ڕاپسکاند و لەبن باڵـی هەمـووان تینـی دایـە خـۆی، جوانـەگام جوانەگایـە، ئەمـرۆ هەڵنەهاتییـە سـەت سـاڵە هەڵاتییـە، هەمـوو مشـەوەش بـوون و نەمـا بـەدوای جوانەگاکـە بکـەون، جوانـەگای حەولـە ڕووح چ جێی پـێ جـێ نەبـوو، غاردانـەک غـاری دەدا، مەگـەر حاجـی ئیبـۆ بەربـەر لـە پێشـبڕکێکەی هەڵاتـن لـە مەلعەبەکـەی هەولێـرێ وا خـۆش هەڵهاتایـە، کـۆڵان نەمـا بـەدووی نەکـەون، هـەر کەسـەی ڕووبـەڕووی جوانـەگا دەهـات، لـە ترسـان بەغـار خـۆی لەبـەر لادەدا، نوورەدیـن قەسـاب لـە خـەم و خەفەتـان نێوچەوانـی بووبـوو بـە دوو ئەنگوسـت، هـاواری دەکـردە شـێمە و شـاگردەکانی: صغـرر توتـن گەووادلار. جوانـەگا خەریـک بـوو چۆڵایـی مەیدانـی حەیوانانـی دەبـڕی و لـە دوورەوە وەک خاڵێکـی بەڵـەک دەهاتـە بەرچـاو، هەمـوو بـە دوایـەوە بـوون تـا گەیشـتنە لای مەحەتـەی شـەمەندەفەر کـە چۆڵاییەکـی بەرفـرەوان بـوو، هەمـوو لایەکـی بـەو بەهـارە سـەوز دەیڕوانـی، منداڵـە هوردکـەی خانووەکانـی مەحەتـە بـە جلوبەرگـی جەژنـەوە بـە تەمـای چوونـە بنلەیلـووکان ڕژابوونـە ئـەو نـاوە،

هەندێکیان لەولاوە خەریکی کەلایانێ بوون، کە چاویان بە جوانەگا کەوت هەر ئەوەتەیە زەندەقیان نەڕژا، هەریەکە بە لایەکدا هەڵدەهات، جوانەگاکە محەتەشی بڕی و خۆی کوتایە ناو ڕێست هاوس کە میوانخانەیەکی مۆدێرن بوو و سەردەمی ئینگلیز لەگەڵ محەتە بۆ خەڵکی غەیرە و غەوارە بە مەبەستی حەوانەوە دروست کرابوو، باخچەکەی پڕی مێز و کورسیی گرانبەهای میوانانی شار و کەسانی خانەدان و خواپێداوان بوو، جوانەگاکە مێز و کورسیی بەسەر پێوە نەهێشت، هەر هەمووی بە لەقە و قۆچە بەتینەکانی هووردوخاش و شەقوشلۆق کرد، تەنەکە زبڵەکانی بە قۆچەکانی بەو گۆڕە وەرکرد، بە هەمووان خەریک بوو هەنگڕانە جوانەگای و جوانەگا خۆی نەدەدا دەست و نەدەدا، وەختەکی خەریک بوو باز بەسەر دیوارەکە بدات و ئەوێندەرێش ببڕێ، کەچی ڕمبەی لێوەهات و وەرگەڕاو تەوقی سەری بە عاردی کەوت، لەنکاو قیت بۆوە و ڕمبازێکی دا و لە دیوارەکەش ئاودیو بوو، جوانەگا غاردە و نوورەدین و جەماعەت و چەند جەڵەبەوانێکی مەیدانێش غاردە، یەکدوو شەقاوەی لای منارەی چۆلییش لە ختوخۆڕا بەگەڵ جەماعەتەکە کەوتبوون، جوانەگا گەیشتە

لای قەسابخانە کۆنەکە کە ئێستا دەکەوێتە پشت بینای بازاڕی نیشتمان کە داون تاونی لێیە، ئەوێ قەسابخانەیەکی گەورە بوو، شوێنی سەربڕینی ڕۆژانەی سەتان سەرمەڕ و حەیوانی جۆراوجۆر بوو و گۆماوێکی پڕ لە خوێناو و پڕ لە ڕیخ و قشپل و پاشەڕۆی حەیوانانی لێ بوو، هەروەها هەرچیی پیسایی و قوڕاو و چڵکاو و خوێناوی تری ئەو ناوە هەیە لەوێ پەنگی خواردبووەوە و بووبووە زەلکاوێکی گەنیو، جوانەگای هار و قەش لە تاو ڕووحی، خۆی تێخست و تا ناوەڕاستی گۆماوەکە نەوەستا، گەیشتە ئەوەی نیو پەنجە لە شان و سەرکی بە دەرەوە بوو.

هەموو لە دەوری کۆبوونەوە و پشووێکی حەسانەوەیان هاتەوە بەر و دوعایەکی خێریان خوێند و سەڵاواتێکی بە هەقیان لە دیداری پێغەمبەر دا. شێمە چوو خۆی گەیاندە کلکی جوانەگای نقوومی ناو گۆماوەکە بە هەمووان ویستیان ڕایکێشن، جوانەگا هەر مێشیش میوانی نەبوو، لە ماندوویییان فششە و مششەی کونە کەپووی دەتگوت فششەی دووکەڵی مێشێیە دێتە دەرەوە، نەیانزانی چ بکەن، بە هەمووان هەنگڕانە جوانەگا و نەیانتوانی سانتیمەترێک لە شوێنی خۆی بیبزوێنن. شێمە پیاوێکی زیت و زیندوو

و بــه دەستومسـت بــوو، بۆكسـی لــه كــەرێ دابايــه دەيتراند، كەچـی ئێسـتا دەسـتەپاچه دامـاوه، بيـری كردەوه كه وەزعەكه هيـی بازوو بەكارهێنـان نييـه، بەڵكوو بيركردنـەوه بـۆ ڕزگار بـوون لـەم كێشـەيه باشـترين چارەسـەره، دەستەسـڕه ئارەقاوييەكـەی بــه هەنيــه و دەموچـاوی داهێنـا و دەمێـك ڕامـا و بـه حاجی نوورەدينی وەسـتای گـوت، وەسـتا بيـر شــەی دوشـندم، نوورەديـن گوتـی چييـه؟ دەی شـێمه حـەل چييـه؟ شـێمه چـوو لـەو نـاوه كۆنـه كيســه چەمەنتـۆی كارگــەی چەمەنتـۆی بادووشــی لــه عــاردی هەڵگرتــەوه كــه پاشــماوەی چەقاندنــی كێلــه قەبرەكانــی قەبرســتانی چراغــێ بــوون و لــەوێ فــڕێ درابــوون، شــێمه شــخارتەيەكی لــه بەڕكـی دەرهێنـا و كيسـه كاغەزەكانـی خسـته بـن كلكی جوانەگاكه و ئاگرێكـی تێبـەردا، دوای كەمێك هـەر كـه گەرمـی گەيشـته بن كلكی، جوانـەگا لەتـاو سـووتانی، دەمنـی شـاتكه شـێتەيه و دەرپەڕينـەك دەرپـەڕی، بەمـلا و بـەولادا دەهـات دەتگوت كەرتـه شـاخه بـه لادادێ، لـه هەمـوو لاوه بـۆی هاتـن و لـه عارديـان دا.

هــەواڵ گەيشـته حاجـی غانـم و ديوەخانــی برايماغــا و كۆلانــی قەســابان كــه جوانەگاكــه گيرايـەوه، ئيتـر بـۆ چەقـۆ بـه مـل داهێنـان و

قوربانییەکە لە هەموو لا بووە ئەگلەنجە و خواردنەوەی ئارەقی مەستەکیی تام ڕازیانە بە جاجیکی ماستی مەڕ و تکە و جگەری برژاوی جوانەگا، حاجی و ماجی و هەموو قەسابەکانی هەولێر بەم بۆنە خۆشەوە بە مەستیی ئارەقی تام بنیشتی کوردی لە هەلەکەسەمادا بوون، ئەو ڕۆژە بووە بەزمێک نەبێتەوە. پاشتر مامۆستا گیو هەواڵەکەی لە گۆڤاری هەتاو بڵاوکردەوە و وەک مێژووی ڕووداوێکی سەیری ڕۆژێکی شارەکە بۆ هەتا هەتایە تۆمار کرا.

# سێوەلاسۆرە و
# فرمێسکەکانی منداڵیم

سبەینان کە لە خەو ڕادەبووم، بالیفەکەم تەڕاییی فرمێسکەکانی شەوێمی بە سەرەوە دەما، تەڕاییەکی نم و کزر. شەوان کە لە بیرکردنەوەکانم ڕادەچووم، فرمێسکم جۆگەلەی دەبەست، بیرم نایێ شەوێکی منداڵیمم بێ گریان بەسەر بردبێت، بەدەست خۆم نەبوو من هەر لە منداڵییەوە گرینۆک بووم. زۆر شەوانیش ئەوەندەی یەک کوندە، میزم بەخۆمدا دەکرد، بۆیە جێوباڵینگانیشم گەلێکجار بە تەڕی دەمایەوە.

من کە بە نازی دایکە قەشەنگە جوانەمەرگەکەم (دایە بەسێ) گەورە بووبووم، کەچی دوای مەرگی لە ناکاوی، لە هەموو نازێکی منداڵی بێبەش مامەوە. ڕۆژانە دوای ئەوەی بابم دەڕۆیشتە دەرەوە، ئیتر زەبروزەنگە دەروونی و جەستەییەکانم بە هۆی دایکە تازەکەمەوە سەریان هەڵدەدا، قەت ئەوەم لەبیر ناچێتەوە کە لە باوەشی دایکی خۆم خەو دەیبردمەوە،

ئەو یادگارییانە خۆشترین سۆزی ڕابردوومن، بۆنی سینگ و بەرۆک و مێخەکەکانی گەردەنی کێلی، بەرامەی ڕەشە ڕەیحانەکانی گیرفانی، کراس و کورتەکە بە باقوبریقە سیمدارەکەی، تا ئەو ڕۆژەی شۆڕی ناو قەبرێم دەکەنەوە لە یادگەم ناسڕێنەوە، هیچ ئیسراحەتێک ناگاتە ئیسراحەتی ئەوەی کە سەرم بە کۆشی ئەو دەکرد، بالای شەنگی پڕ بوو لە زڕەوپۆلیی، کلاوە هەورییە پڕ لە کۆترۆکەکەیم قەت لە دیدە ناسڕێتەوە. کۆچی ناوادەی دایەم منی لە هەموو جوانییەکانی منداڵی دابڕی.

بابم دەمێک بوو هەستی کردبوو ئەو زڕدایکە مەلعوونەم کە لای خۆم بە (مەلعوونخانم) ناوزەدم دەکرد، لێم ڕقەستوورە و گەر بۆی بلوێ دەست لە خنخنۆکم دەنێ و تا حەیاتم لێ دەبڕێ لێم نابێتەوە. لەمێژە گوتراوە: (ئەگەر دایک بووە زڕدایک، ئەوا بابیش دەبێتە زڕباب). بابە مستۆ کە لە دایەرەی ئەشغال نۆبەتداری کۆگا بوو، سبەینان لەگەڵ شیرەی نێرەکەر لە دەرگای حەوشە ئاودیو دەبوو و تا دوای عەسرێکی درەنگ چاومان پێی نەدەکەوتەوە. تا دایە بەسێم مابوو، ئاگام لەو نەبوو، نەمدەزانی کەی لە ماڵ دەچێتە دەرەوە و کەی دەگەڕێتەوە، خۆ ئەو نەیدەزانی ژنە تازەکەی کە وەرمدەگەڕایێ، جەستەی خنجیلانەمی لە ختوخۆڕا بە قەمپاران

هەنجن بە هەنجن دەکرد، بەڵام دەیزانی کە منی مندالّی حەوت ساڵان لێی هەراسانم، پەشۆکاوی ئۆقرەی لێ بڕیبووم و دەیزانی نەک تۆزقاڵێ مێریڤانیم بەرانبەری نییە، بەڵکوو ڕقی دونیام لێیەتی، ئەمە بابمی زۆر نیگەران کردبوو، من تەواو هەستم بەوە دەکرد، بۆ ئەوەی لەو کەشە مەرگەمووشاوییەم بێنێتە دەرەوە، ڕۆژێکیان بانگی کردم، تێری ماچ کردم و پێنج فلسی زیادەشی لەباخەڵینام و پێی گوتم: (کوڕێ من، وا چاکە لێرەوە، لەو تەمەنەوە خۆت بە کار و کەسابەت ئاشنا بکەی)، من تێینەگەیشتم تا پێشنیازی بۆ کردم کە دەیهەوێ بمخاتە بەردەست دوکاندارێکی هاوڕێی کە وەستای دروستکردنی کورسی و قەنەفە و تەختەی دار بوو، با بڵێین دارتاش بوو.

بەیانییەکەی بردمییە لای وەستا عەزیزی نەجاڕ، کە پێشتر لەمبارەوە قسەی لەگەڵ کردبوو. دوکانەکەی وەستا عەزیز بەرانبەر مەکتەبی بۆتان بوو، لە ڕیزی چایخانەی ئاغا دزەییەکان. بەیانیی ڕۆژی دووەم سبەینە زوو بۆ یەکەمجار، بووم بە شاگردی وەستایەکی کەچەڵی سەر ڕووتاوە، وەستا عەزیز بەردەستیی پێ دەکردم، سەرباری وردە ئیشی دارتاشی، دەیناردمە سەعدووناوە، وردە کەلوپەلی ڕۆژانەی ماڵەوەشی پێ دەکڕیم، دەیناردم چای لە چایخانەکەی مام ڕەحمان

بۆ خـۆی و میوانەکانـی بێنـم، درەنگانـی پـاش نیوەڕۆیـان دە فلوسـی دەدامـێ و بەڕێـی دەکـردم، کـە دەگەیشـتمە ماڵـەوە، دەبـووا دە فلوسـەکە لـە مستی زڕدایکەکەم بنێم، ئەو وای ڕاهێنابووم، خۆ نەدەوێـرام ڕۆژێ پێنـج فلـوس خـەرج بکـەم.

وەسـتا عەزیـز پیاوێکـی غـەدداری چـاو حیـزی بـەد ڕەوشـتی جەمالسـێوان بـوو، یەکجـار زۆر لێـی بـە هەستوخوسـت بـووم، کـە ئـەو لـە دوکانـێ بـە تەنیـا دەمایـەوە، مـن نەدەوێـرام لـە ژوورەوە بـم، بەڵکـوو لەبـەر دەرگا هەڵدەترووشـکام و چەنـدی بانـگ بکردبـام قـەت لای نەدەمامـەوە. دە ڕۆژێـک لـەم کارەم بـەردەوام بـووم. بیرمـە سـبەینەیەکی ڕۆژی هەینـی، بابـم دەیبردمـە لای ناسـیح حەلـلاق کە دوکانەکەی بە تەنیشـت حەمـام عەسرییەوە بوو لە کۆلانـی عارەبـان تـا سـەروپۆتەلاکم چاککات، بـە بابمـم گـوت چیتـر مـن ناچمـەوە لای وەسـتا عەزیـز، چونکە پیاوێکی ئەخلاقسـزە و مـن لەوانـە نیم مل بۆ داخوازییـە پۆخڵەکانـی بدەم، مـن دەمـەوێ ئیشـێکی تـرم بـۆ بدۆزییـەوە. دامنابـوو گـەر بەقسـەم نـەکا، سـەری خـۆم بـەرەو چارەنووسـێکی نادیـار هەڵگـرم. بابـم لـە وەزعەکـەم تێگەیشـت. ڕۆژی شـەممەم بـێ ئیشـوکار لەگـەڵ منداڵانـی کـۆڵان بەسـەر بـرد، ئـەو منداڵانـەی کـە بەنـازی دایـک و بابیـان لـە کـۆڵان کەیفسـاز بـوون و منیـش دڵ و دەروونـم پـڕ بـوو

لەو گریانەی کە ژیانی نالەبار و چارەنووسم تێی چاندبووم.

ئێوارەی شەممە بابم بانگی کردم و گوتی واچاکە بۆ خۆت ئیشی سەربەخۆ بکەی و بە ئازادی خۆت پێبگەیەنی و کەس وەک چاودێر و وەستا بەسەرتەوە نەبێ، پێمباشە دەسگێڕی بکەی و من تریانێکی نووردییە نانت دەدەمێ و یەکەم ڕۆژ دەتبەمە لای محێدینی دوکاندار لای شێخی چۆلی و چەند کیلۆیەک سێوەلاسۆرەت بۆ دەکڕم و برۆ بۆ خۆت لە کووچە و کۆلانەکان بگەڕێ و تاک تاکە بیانفرۆشە منداڵان. مام محێدین باوکی شوانی هاوڕێم بوو (ئێستا کاربەدەستێکی گەورەی میرییە) کە پیاوێکی خانەدان و هەژاردۆست بوو و لە زۆر ئیشوکاران، هاوکاریی بابمی دەکرد.

یەکەمین ڕۆژی ئەم کارە تازەیەم لە کووچە و کۆلانە تەنگەبەر و ناڕێکەکانی تەیراوە بە ئاسوودەیی بردە سەر، دوو دانە سێوەلاسۆرەم بە پێنج فلوس دەدا. بیرمە دەچوومە نێو کووچەکانی دەوروبەری چایەخانەی بابیز بەولاوە و بە هەموو گەرووی خۆم هاوارم دەکرد: (سێوەلاسۆرە سێوەلاسۆرە، سێوەسۆرەی مزر و خۆش، دەی وەرن دووی بە پێنج فلوس). هەموو دەوروبەری نیوەڕۆیانیش دەچوومە سەر عەرەبانەکەی مام عیزەدین و یەک سەندەویجی تەواوم بە توورشییەوە دەخوارد.

ئێوارە کە دەگەڕامەوە دەنگم دەنووسا، ئەوەندەم هاوار کردبوو، ئێوارەی یەکەمین ڕۆژم لە ڕێی گەڕانەوە تەواوی پارەکەمم ژمارد، بۆم دەرکەوت درهەمێکم قازانج کردووە، ئەمەش لەچاو کاری پێشووم بڕە پارەیەکی زۆرتر بوو.

ئەم دەسگێڕییەم جگە لە سەربەخۆیی و دەروون ئاسوودەیی و وابەست نەبوونم بە کەسێکی دیاریکراوەوە، قازانجێکی تریشی بۆم هەبوو کە ئەوە بوو دەمتوانی ڕۆژانە شتێک بۆخۆم خەرج بکەم بەبێ ئەوەی مەلعوونخانم پێیبزانێ. تا دەهات زێتر شارەزای سێوفرۆشی دەبووم و قازانجم ڕووی لە زیادی دەکرد.

ئێوارەیەکیان لە قەڵا نزیک کەوتمەوە و حەزی چوونە سەر قەڵا و سێوفرۆشییەکەم هانیدام بە دەروازەکەی لای بازاڕ وردە وردە سەرکەوم، کە دەرگاکەی ڕووی لە بازاڕی قەیسەرییە، تازە لای شێخی چۆلییەوە دەهاتمە ئەو ناوە، بە هانکەهانک سەرکەوتمە سەر قەڵا، کە یەکەمجارم بوو سەردەکەوتم، ڕێگا پێپلکەکەی یەکجار ڕک و خۆڵاوی بوو، بە هەر جۆرێ بوو، سەرکەوتم و ئەوێم زۆر بەلاوە نامۆ بوو و هەستی ئەوەم هەبوو وەک ئەوەی چووبمە شارێکی دیکەی دەرەوەی هەولێر. لەوێ زۆرم سێوەلاسۆرە فرۆشت، دەمەو نیوەڕۆ داهات و نیوەی سەبەتەکەم لە سێو بەتاڵ ببوو،

بەرکم پڕی پارە بوو. دوای گەڕان و سووڕانێکی زۆر، لە دەرگای ئەودیو نزیک دەکەوتمەوە کە منداڵە قەلاتی خەریکی شەڕ پێفرۆشتنم بوون، ناچار هەنگاوەکانم خێراتر کرد و کە گەیشتمە دەرگای دیوی مەحکەمە، پشوویێکی پڕ لە فەرامۆشیم وەرگرت و هەوای ساف و فێنکی ئەو ناوە، ئارامییەک و دەروونئاسوودەییەکی دامێ، خەریکی هەنگاونان بووم بۆ خوارەوە بۆ ئەوەی بەرەو ماڵ ببمەوە، لە ناوەندی ڕێگاکە کە ڕێیەکی زۆر ڕک و قوڕاوی بوو، هەستم کرد لە خوارەوە غەڵبەغەڵبێکی زۆرە و کە تەواو دیقەتمدا، زانیم ئەمە گەلەکۆمەی منداڵە وردکە و هەرزەکارانە بۆ هێرش و هەڵکوتانە سەر قەلا. بەرد هاوێشتنێک بوو نەبێتەوە! هەر نیمچەگاشە بوو لە تەنیشتمەوە گڤڤەی دەهات و بە عاردی دەکەوت. ئەم وردکە کەرپووچبارانە لەکوێوە هات خوایە گیان؟ بە پەلە بەرەو چوونەوە ناو قەلا تا بڕستم تێدا بوو ڕامکرد، زانیم شەڕە بەردی نێوان قەلا و تەیراوەیە، شەڕێک بوو ئەسکووی تێ نەدەگەڕا. هەمووجار شاکری مامم بۆی باس دەکردم کە چۆن بەشداریی قارەمانانەی لەو شەڕانەدا کردووە، مامە شاکر وەک چۆن فیلم دەگێڕێتەوە، ئاوا داستانی قارەمانێتیی خۆی و هاوڕێکانی تەیراوەی بۆ باس دەکردم. باسی ئەوەی بۆ دەکردم کە چۆن بەهێرشی ئازایانەیان، منداڵە قەلاتییان ڕاوناوە و لەناو قەلایان

پەستوونەتەوە و دواتر چۆن سەر قەلا کەوتوون و چۆنیش تا کۆشی دایکیان سەریان لەدوو ناون.

هەنگاوەکانمم خێراتر کردن و لە سەرەوەی قەڵاش لە لێوارەکەیەوە هێرشبەرانی قەڵا تا هێزیان تێدا بوو وردە گاشەبەردەکانیان دەهاویشتە تەیراوەییەکان، لەو ناوە خڕکەبەردێکی گەورە بەر شانی چەپم کەوت، خوێن فیچقەی کرد و ئەوەی باش بوو دەسەسڕە گەورەکەمم لە شانوپیلم ئاڵاند و دوای کەمێک خوێنەکەی وەستا. شەقاوە هێرشبەرەکانی تەیراوە منیان بە هێرشبەر و سەردەستەی قەڵاتییەکان دەزانی و ئەوانەی قەڵاتیش تا هێزیان تێدا بوو هێرشیان بۆ سەر من زیاد دەکرد، ناچار ڕوو لە خوارەوە بکەم و تا هێزم تێدابوو لاتەریکانە هەنگاوم نا، لەپڕ هەڵخلیسکام و خراپ گلام، تاکە پێڵاوە لاستیکە شینکەلەکەم و سەبەتە سێوەکەم لەدەست چوون و غلۆر بوونەوە و هەر سێوەی بەلایەکدا چوو. بەهۆی ئازارەکەی شانم ئاگام لە سەبەتە و سێو نەما. کە گەیشتمە دامێنی قەلا، هەندێ لە تەیراوەییەکان بەهۆی هوروژمیان بۆ سەرکەوتنە سەر قەلا، خۆیان و دارلاستیک و بەردەقانییە پڕ لە خڕکە بەردەکانی دەستیان هەنگاویان دەنا و ئاگایان لەمن بڕابوو، منیش خۆمم دابووە لایەک، کەچی چەندانێکیشیان بەدوامەوە بوون تا

گرتمیان، خەریکبوو خۆمیان لەدەست ڕاپسکێنم، کەچی ئەوان بەهێزتر بوون و تا تێمگەیاندن کە من شەکەراتفرۆشم و قەلاتی نیم و لە کۆلانی عارەبانەوە هاتووم و پێوەندییەکم بەو شەڕانەوە نییە و هەر بۆ فرۆشیاری چوومەتە ئەوێ، چەندانێکیان وەرمگەڕانێ و دەمولێویان پڕ خوێن کردم، پارەکەی گیرفانمیان دەرهێنا و بەرەڵلایان کردم.

بە لاکەلاک ملی ڕێگام گرتەبەر و گەیشتمەوە دەوروبەری ماڵەوە، یەکسەر خۆمم کوتایە ناو مزگەوتی حاجی حوسێن و نەمهێشت مام دەروێشی خادیمی مزگەوت بمبینێ، سەروسەکوتی خۆمم دایەبەر شێرەی ئاوەکە و نەمهێشت ئاسەواری تێهەڵدانەکەم بە ڕوخسارمەوە بمێنێ، دواتر لە ترسی مەلعوونخانم نەوێرام بچمەوە ماڵەوە، بۆیێ ناچارمام خۆم تا دەمەو بانگی مەغریب دوابخەم، تا باوکم دێتەوە و بەسەرهاتەکەمی بە وردی بۆ باس بکەم. ڕووەو ژێر قادرمەکانی مزگەوت هەنگاوم نا، کە پڕی بوو لە تاتەشۆر و دارەبازە و کۆنە مەسینە و قاپقاپی شکاو. جەستەی وردمم لەنێو دارەمەیت و تاتەشۆرە شەقوشلۆقەکان بزر کرد و خەوێکی خۆش بردمیەوە، لەخەوما پڕ بە بنار و لاپاڵی قەلا زەبەلاحەکە سێوەلاسۆر دەهاتنە خوارەوە و لە خۆشییان نەمدەزانی باوەش بە

چەندانێکیاندا بکەم. دادەنیشتم سێوەلاسۆرەم پڕ کۆشم دەکرد و لەگەڵ منداڵە وردکەکانی هاوڕێم لە خۆشییان سێومان لە یەکتر دەگرت و بەوپەڕی پێکەنین و خۆشییەوە ڕاکەڕاکەمان بوو، لە پێکەنین و ڕاکەڕاکەی خۆم خەبەرم بووەوە و کە بەئاگا هاتم مەغریب بانگی دەدا. هەستم کرد لە ناوک بەخوارەوەم تەڕ ببوو و خەریک بوو دەقەسریم و وەک بیی ناو ئاو هەڵدەلەرزیم. ئێستایشی لەگەڵدا بێ نەمزانی لەترسان بوو یان بەهۆی خەوە قووڵەکەمەوە بوو کە بەقەد یەک کوندە، میزم بەخۆمدا کردبوو!

# هەفتەنامەی بەدبەختەفەندی

بەیانی زووی یەکەم ڕۆژی هەفتە، کە لە ماڵ هاتمە دەرەوە، ژنەکەم داوای کرد، لە گەڕانەوەم ماسیحەیەک لەگەڵ خۆم بێنمەوە، چونکە ماسیحەی حەوشەکەمان شکاوە. کە بەڕێ کەوتم، گوتم نەبادا لە گەڕانەوەم بیرم بچێ، با هەر لە ئێستاوە ماسیحە بکڕم ئینجا بۆ ئیشوکار بڕۆم، لە ڕێ لامدا جادەی شەهید سمکۆ مەنتک و لە مێنی مارکێتێک سەرە ماسیحەیەک و دار ماسیحەیەکم بەیەکەوە بە سێ هەزار دینار کڕی. تەماشای سەعاتم کرد بینیم هێشتا کاتەکەی بەبەریەوە ماوە، با ماسیحەکە ببەمەوە تا خانم حەوشەکە بشوات کە دوێشەو بەهۆی خۆربارانەوە ڕەنگی کاشییەکەی نارنجیی هەڵگەڕابوو.

کە گەیشتمە ماڵەوە، نایلۆنم لە ماسیحە داپچڕی و خەریک بوو دارەکەی لەناوقەد توندکەم، دارەکەم لەبەرنا، بینیم داییسی ماسیحەکە زۆر گەورەترە لە ئەستووریی دارەکە، یان بڵێین دارەکە باریکترە

و بۆی نابێ، چەندی هەوڵمدا و سەرم هێنا و برد یەکانگیر نەبوون، ناچار هەڵتەک هەڵتەک ماسیحەم بردەوە مێنی مارکێتەکە، کوڕێژگەیەکی لەسەر بوو و پێشتر من لە باوکەکەیم کڕیبوو، تێمگەیاند کە ماسیحە و دار پێکناکەن و داوام کرد بۆمی بگۆڕێتەوە، کەچی کوڕێژگە گوتی: دەبێ بابم بێتەوە، خۆ لە منت نەکڕیوە!

ناچارمام نیو سەعاتان لەبەر ئەو هەتاوە تاقەت پرووکێنە خۆمم خافڵاند تا بابەی جامانە بەسەری کورتەک لە ڕەنگێک و شەرواڵ لە ڕەنگێک، هاتەوە و دوای منجەمنجێکی زۆر ماسیحەی بۆ گۆڕیمەوە. من هیچم نەگوتبوو کەچی ئەو چەند جارێک پێیگوتم:

مەوادی ئێمە هەمووی ئەسڵییە. جا بۆخۆت تێبگە! دیسانەوە بەرەو ماڵ بوومەوە، تا ماسیحەم گەیاندەوە، دواتر گەیشتمەوە دەوام، دەوام قەیاسێکی مابوو. بەیانیی یەکشەممە خۆم لە حەمامی ماڵەوە کوتا، تا بەر لەوەی بچمە دەوام وەک هەموو ڕۆژان، خۆم بشۆم، لە حەمامەکە بینیم تەشتاوە باغەکە کە سێ ساڵ دەبوو کڕیبووم، کون بووە و تەواوێک ئاو لەبەریەوە دەڕوات. کە لە ماڵ هاتمە دەرەوە یەکەوسەر بەرەو دەوام ڕۆیشتم و بیرم کردەوە کە باشتر وایە لە گەڕانەوەم تەشتێک بۆ حەمام بکڕم.

سەعاتێک بەر لە تەواوبوونی دەوام هاتمە دەرەوە و لە ڕێ چوومە دوکانی باغە فرۆشێک و تەشتێکی سپیی نورتونوێی ناو نایلۆنم کڕی. گەیشتمەوە ماڵەوە و تەشتەکەم خستە حەمام و کۆنەکەیشم لە دەرەوە لە تەنیشت زبڵدانی بەردەم دەرگاکەمان دانا.

خۆم لە حەمام کوتا تا بەر لە چوونە دەرەوەم، ئاوێک بەخۆمدا بکەم، تەشتەکەم ڕاکێشایە لای خۆم، هەستم کرد تەشتەکە زڕە دەنگێکی لێوە دێ، بە ئاستەم لە عەردەکەمدا هەستم کرد تەشت شکاوە، بە دوای شکانەکەیدا گەڕام، بینیم لە تەنیشتەوە درزێکی ستوونیی تێکەوتووە. خەمی بەدبەختی دایگرتم و نەمزانی چۆن خۆمم شوشت! بە خۆم و تەشتەوە هاتمە دەرەوە، دراوسێکان تەماشایان دەکردم و بە لایانەوە سەیر بوو کە دەبێ ئەو تەشتە کێوە بەرم! گەیشتمەوە لای باغەفرۆش و تێمگەیاند کە تەشتەکە کون بوو و داوام لێی کرد کە دەبێ بۆم بە تەشتێکی نەشکاو بگۆڕێتەوە، کابرای باغەفرۆش نێوچەوانی تێکنان و بەمە زۆر قەڵس بوو و دوای مشتومڕێکی زۆر، سوێندم بۆی خوارد کە تەشتەکەم بە شکاوی بردووە بێ ئەوەی پێی بزانم. بە سەت دەردەسەری بۆی گۆڕیمەوە، ئەویش هەر دەیگوت و دەیگوتەوە: مامۆستا ئێمە

شتی شکاو و عادیمان نییە، مەوادی ئێمە فوول ئەسڵییە.

تاریک و ڕوونی بەیانی لە خەو ڕابووم ویستم وەک ڕۆژان، خۆم بشۆم. چرک ک ک، پلاکی گڵۆپی حەمامەکەم پێکرد، لەگەڵ پێکردندا چرتەیەک لە گلۆپەکەوە هات و سووتا، هەمووی مانگێک بوو گلۆپەکەم بە گرێنتی و ئەسڵی کڕیبوو. بەو تاریکییە خەریکی خۆ شووشتن بووم، نەمدەزانی چۆن سابوونم لە لیفکە هەڵدەسووی، بە سەت حاڵ لەو تاریکستانە خۆم شوشت، دواتر سواری ترومبێل بووم و چوومە دەوام، شەوکەتی فەڕاشم بانگ کرد و دە هەزارییەکم لە مستی نا و داوام لێی کرد کەی مەجالێک بوو بچێ لە دوکانەکانی جادەی سێتاقان گلۆپێکی ڤیستەڵی لەولەبیی قوونک بورغووی ئەسڵیم بۆ بکڕێ و باقییەکەیش بۆ خۆی. دەوروبەری سەعات یەک، شەوکەت گڵۆپێکی نێو پاکێتی بۆ هێنام و تێیگەیاندم کە گلۆپەکە ئەسڵی و ئەووەلبابە. سوپاسێکی گەرمیم کرد.

کە چوومەوە ماڵەوە، دوای نانخواردن چوومە حەمام تا گلۆپەکە بگۆڕم، کۆنەکەم خستە سەبەتەی زبڵەکەوە و نوێکەیم جوان جوان قایمکرد، پاشان چرک ک ک، پلاکەکەیم

پێکرد، کەچی گڵۆپ ترووسکەیەکی ڕۆناکیی نەدامێ، بۆم دەرکەوت کە گڵۆپە نوێیەکەش سووتاوە، دیسان خەم دایگرتم و هەزار جنێوم بە بەدبەختیی خۆم دا.

عەسرەکەی لە تاریکی خەریکی دەسنوێژ هەڵگرتن بووم و پاشتر تێلم بۆ شەوکەت کرد. شەوکەت دوای کەمێک هاتەماڵەوە و تێمگەیاند کە گڵۆپەکە سووتاوە و داوام لێی کرد بچێ بە یەکێکیتر بیگۆڕێتەوە، شەوکەت کەوتە منجەمنج و پرتەپرت. بۆ ئەوەی ئارام بێتەوە، ناچار پێنج هەزارییەکم لە گیرفانی نا، دوای سەعاتێک شەوکەت هاتەوە و گوتی:

مامۆستا، کابرای دوکاندار گڵۆپەکەی بۆ نەگۆڕیمەوە و گوتی بڕۆ وەستات بانگکە، گوتم وەستات کێیە؟ گوتی: جەناب، مەبەستی تۆیە. ناچارمام لەگەڵ شەوکەت بچمە لای دوکاندار و داوای لێ بکەم گڵۆپەکەم بۆ بگۆڕێتەوە، دوکاندارەکە حاجییەکی کەشیدە لەسەری دەم بە وێرد و سەڵاوات بوو، ناچار بە ڕوویەکی خۆشەوە لەگەڵی کەوتمە قسە، کەچی ئەو وەک سماقفرۆشێکی زۆر تووڕە و تۆسن دەهاتە بەر چاو، بەڵام دوای پرتەپرت و منجەمنجێکی زۆر، گەیاندمە قەناعەت کە گڵۆپەکە لە ئەساسەوە

سووتاوە، کەچی ئەو هەر دەیگوت: مەوادی ئەم دوکانە کە بایی پەنجا دەفتەر دەبێت، یەک شتی تێدا نییە زۆر ئەسڵی نەبێ، ئەمە یەکەمجارە شتی وا لێرە ڕوودەدات، دەیگوت: هەموو مەوادی ئێمە ئەسڵییە.

سێشەممە، دوای نیوەڕۆ درەنگ لە دەوام هاتبوومەوە، ویستم ئێوارەکەی ئیسراحەتێ بکەم و نەچمە دەرەوە و کتێبێک بخوێنمەوە، دوای عەسرێکی درەنگ کوڕەکەم گوتی: باوە، هەر دەبێ بمبەیتە لای مۆبایلفرۆشەکەی سەر شەستی، زرێی (درع) مۆبایلەکەم زۆر درزی تێکەوتووە، بەڵکوو بیگۆڕم. ناچار ترومبێلم بە گەڕ خست و چووینە لای مۆبایلفرۆشەکە، ئەویش پوختە و جوان داخوازییەکەی جێبەجێ کردین و گەڕاینەوە..

تازە لە نوێژی عیشا هاتبوومەوە و لە ژوورەکەی خۆم خەریکی خوێندنەوەی ڕۆمانێکی خوسرەو جاف بووم، لەپڕ بووە هەرای نێوان هەردوو کوڕەکەم، کە بەردەوام شەڕ و ئاژاوەیانە و قەت دانوویان بە یەکەوە ناکوڵێ، هەردووکیانساڵێکیان بەینە، ئیسراحەتیان لەو ماڵە نەهێشتووە، چەندە ئامۆژگارییم دەکردن، بێسوود بوو. ئەوەی مۆبایلەکەیم بۆ چاک

کردبووەوە دەیگوتە ئەوەکەی دی تۆ زرێکەیت لێ شکاندووم، ئەویش دەچووە کەشکەلانی فەلەک و دەهاتە خوارەوە دەیگوت من نەبووم، زرێیەکە خۆی عادییە و بزانە بەر شتێ کەوتووە و شکاوە. بۆ ئەوەی وەزعەکە ئارامکەمەوە هاوارم کردنێ: کڕ بن دەویت بابینە.

بەو شەوە بۆ لای مۆبایلفرۆشی گۆڕین ڕاپێچیان کردم، تا دیسانەوە زرێیەکە نوێکەینەوە. کە گەیشتینە لای مۆبایلفرۆشەکە، خەریک بوو دوکانەکەی دادەخست، بەهۆی ئێمەوە کەمێ خۆی دواخست و کوڕەکەم پێیگوت: (عەممۆ، ئەو زرێیەی تۆ عادی بوو، بەڵکم یەکێکی ئەسڵیمان بدەیتێ)، کابرا لەو قسەیەی کوڕەکەم چاوی چووە پشتی سەری، تەواو دەهری بوو و هاواری کرد: یانی من شتی عادی دەفرۆشم؟ بڕۆن نیمە. بەهەزار حاڵ کابرام هێورکردەوە، کەچی ئەو هەر پرتە و بۆڵەی بوو و باسی لەوە دەکرد کە خۆی، تایبەت بۆ هێنانی ئەم کەلوپەلە ئەسڵییانە دەچێتە چین. کە پارەی زرێ تازەکەمان دایێ، ڕووی کردە کوڕەکەم و گوتی: جارێکیتر ئەم قسانە لای من نەکەیتەوە، بۆ خۆت کەیفی خۆتە بە کێی دەڵێی، بەڵام من نا، ئەم دوکانەت بینیوە؟ لەوەتەی هەیە شتی عادیی نەهاتووەتێ،

شتەکانی من هەمووی ئەسڵیین. بەهەر حاڵ، ناچار سوپاسێکی گەرممان کرد و گەڕاینەوە.

شەوی ڕابردوو بەهۆی ژانی ددانێکمەوە خەو نەچووبووە چاوم، سەیرە! هەمووی هەفتەیەک نابێ ئەو ددانەم پلاتینرێژ کردووە و سەت دۆلارم داوەتە دختۆرێکی عارەب کە گوایە باشترین دختۆری شارە، کەچی بۆ من وا نەبوو و ژانەکەی بەری نەدەدام. ناچار بەو سبەینەیە ڕوومکردە نەخۆشخانەیەکی ئەهلیی سەر ڕێی کۆیە، ئەو نەخۆشخانەیە دختۆرێکی هاوڕێی خوێندنمی لێبوو، ناوی دختۆر شەماڵ بوو کە نزیکەی بیست ساڵ بوو نەمدیبوو، پسوولەی دختۆر شەماڵم بڕی و کە سەرەم هات چوومە ژوورەوە. دختۆر شەماڵ کە چاوی پێمکەوت، کۆڵێ دڵخۆش بوو و زۆری ڕێز لێنام، ددانە بە ژانەکەمم پیشاندا و جوان پشکنیی و پێیگوتم: مامۆستا، ئەو پلاتینەی دختۆرەکەت بۆی داناوی لە جۆری خراپەکانە و بە تەواوی نەچەسپیوە، من ئێستا تەنیا ئیشی دروستکردنی ددان دەکەم و دەتنێرمە ژوورەکەی تەنیشتم کە دختۆر حەمیدی لێیە و ئەو شارەزای دانانی پلاتینی ئەسڵییە. ڕوومکردە دختۆر حەمید و دوای سەعاتێک هێنان و بردن و ڕنین و غڕوهۆڕی مێشکهەژێن، دختۆر

حەمید پلاتینە عادییەکەی ڕنی و پلاتینی ئەسڵیی ئەووەلبابی بە سەتوپەنجا دۆلار بۆ دانام. دختۆر حەمید هەر دەیگوت و دەیگوتەوە: ئەو پلاتینەی بۆت دادەنێم جۆری یەکجار ئەسڵییە و گەر تا ساڵێکیتر عەیبی هەبوو، من بەرپرسیارم، شتی ئەم نەخۆشخانەیە هەمووی ئەسڵییە و بابەتی عادیی نایەتێ.

بەیانی زوو کە لە خەو ڕابووم، هەواکەی زۆر سارد بوو، خۆم لە حەمامەکە پەستا و شێرەی دەستە چەپی ئاوە گەرمەکەم کردەوە و چاوەنۆڕ بووم کە گەرم داهات بە سەر و گوێلاکی خۆمی دابکەم، کەچی ئاوەکە سارد سارد، گەرمەکە نەهات و نەهات، بۆم دەرکەوت کە بە دڵنیاییەوە لوولە هیتەرە ئۆتۆماتیکەکەی بۆیلەرەکە سووتاوە، ناچار جلەکانم کردەوە بەر..

لە ماوەی دە ساڵی ڕابردوودا، ئەوە یەکەمجارمە بێ خۆ شووشتن لەماڵ بێمە دەرەوە. تا دەوام تەواو بوو هەستم دەکرد هەموو لەشم دەخورێ. لە گەڕانەوەم سەرێکی بازاڕی کوورانم دا و لوولە هیتەرێکی ئەسڵیی بۆیلەرم بە گرێنتیی ساڵێک بە دە هەزار دینار کڕی. دوکاندارەکە گوتی: مامۆستا، خەمت نەبێ، ئەمەیان زۆر ئەسڵییە..

سپانە سەر زلەکەی تایبەت بە هیتەر گۆڕینی بۆیلەرم لە ماڵەوە هەبوو و دوای نانخواردن هێنام و کۆنەکەم لێکردەوە، ئاو ئەوناوەی پڕ کرد، هەموو قالبم لە تەوقی سەرم تا بنی پێم لە ئاو هەڵات، باش بوو نویکەیم بە ئاسانی تێ گیرکرد و بە سپانەکەی خەریکی بادان و قایم کردنی بووم، وەختێکم زانی گرتی و نەختێ قایم بوو، نا با نەختێکی تریشی بۆ بادەم، هەستم کرد قایم بوو، دڵم ئاوی نەخواردەوە نەوەکا ئاودزیی تێکەوێ هەر بامدا و بامدا، بەم زستانە ئەوەندە بە هێز بامدەدا، ماندوویی هەردوو بازووم، ئارەقەی لە هەنیەم داچۆڕاند، هەر بامدا، دەی کەمێکیتر، نا ئەمجارەش، تا لەناکاو شرقەیەکی لێوەهات و داییسی هیتەرە لوولەییەکەی لەناویڕا شکا. خەمێکی قووڵ دایگرتم! باشە، بەدبەختەفەندی.. ئەمە کەی کاری تۆیە توخوا؟ ئێ نەدەبووا وەستایەکی شارەزا بێنم؟ عەجایب! تەماشای داییسەکەم دەکرد کە لە بنوبۆتکەوە شکابوو و وایەری نەدەچووە سەر. بیرم دەکردەوە کە ئەمە مەحاڵە بە من و بە بابی منیش چاکبێتەوە. دەمەو عەسر سلفێکم لە ترومبێلەکەم دا و بۆڕیچییەکم لەو دەوروبەرە بینییەوە، ئەویش پێیگوتم کە بەهۆی ئیشی زۆرەوە مەجالی نییە تا لەگەڵم

بێت بۆ ماڵەوە، ژمارەیەکی دامێ تا پێوەندیی پێوە بکەم کە ناوی وەستا سەردار بوو، زەنگم بۆ وەستا سەردار لێدا و کارەکەمم تێگەیاند، وەستا دوای سەعاتێک لەبەردەم ماڵەوەمان حازر بوو و تەماشایەکی بۆیلەرەکەی کرد و پێیگوتم: ئەمە چ حەیوانێک ئاوای شکاندووە؟ وەرامیم دایەوە کە ئەمە خوێڕییەکی ئامۆزام گوایە وەستایە، لێیشی تووڕە بووم و دەرمکرد و نەمهێشت چیتر دەستی بگەیەنەتێ. بەهەر حاڵ سەردار چوو سەندووقی ترومبێلەکەی کردەوە، لوولە هیتەرێکی دەرهێنا و پێیگوتم: مامۆستا، ئەمە جۆری ئیتاڵییە و ئەسڵیی ئەووەلبابە و من بە گرێنتیی ساڵێک لە بۆیلەرەکەی دەخەم، بەڵام نرخەکەی کەمێک گرانە و بە بەستنەوە دەکاتە چل هەزار دینار، چونکە خۆی بە بیست هەزارە، ناچارمام سەری ڕەزامەندیی بۆ بلەقێنم و ئەویش چوو خەریکی گۆڕینی بوو. دەمەو مەغریب هەستم کرد ئاوی بۆیلەرە هیتەرە ئیتاڵییەکە نەختێ شیرتێن بووە، خۆمم دایە بەر ڕەشاشەکەی و دوای لێبوونەوەم، چومەوە ژوورەوە، پاڵکەوتم و خەو بردمیەوە.

بەیانی کە لە خەو ڕابووم بینیم سەعات لە نۆ لایداوە، کەیفساز بووم بەوەی کە هەینییە و نەختێک بۆخۆم ئیسراحەتێ دەکەم. دەوروبەری

سەعات یازدە، خانم داوای کرد کە بچم نانی فڕن بکڕم. سەیرە! خۆ منداڵەکانم لەو ماڵە دارێک لەسەر بەردێک دانانێن! خانم گوتی: نیوەڕۆ بە نیازی شفتە دروستکردن ونیسک لێنانم.

کە هاتمە دەرەوە سەعات یازدە بوو، لە نانەواخانەی مام وەهاب نزیک کەوتمەوە و لەبەر قەرەباڵغیی، تەواوێک لەولاتر ڕامگرت و لە نانەواخانەکە هەشت نانم کڕی و سواری ترومبێلەکەم بوومەوە. ترومبێل ئەمڕۆ نییە، بەڵکوو سەت ساڵە ئیش ناکات، قۆڵنجم هەستا ئەوەندەی سلفەکە بادەم، خوایە گیان ئەوە بۆ ئێمەی کورد ژیانمان هەمووی هەر بۆتە بادان؟ جامانە هەر بادە، کەلانکوچک هەر بادە، پشتێن هەر بادە، بەلەکپێچ هەر بادە، لە ژیانیش بەکار بردنی کەلوپەلەکانمان هەر بادانیان دەوێ، هیتەر گۆڕینی بۆیلەر بادانی دەوێ، گلۆپ گۆڕین و ماسیحە گۆڕین و فۆیلپەم گۆڕین و سلف لێدانیش هەر بادانی دەوێ، بادان بۆ کوردان وەک هەناسە و نان و ئاوە. سلفەکەم دیسانەوە بادا، کەچی نەکەوتەوە گەڕ و نەکەوتەوە گەڕ. مۆبایلەکەم دەرهێنا و تێلم بۆ ڕەوەندی کوڕم کرد، دوای دە دەقیقە لەوسەری فولکەکە ئەویش بایدایەوە و گەیشتە لام، تێگەیشتین کە ترومبێلەکەم

فۆیلپەمی سووتاوە. خوایە گیان کەی ئەم هەموو سووتانە بەرۆکم بەردەدات؟ سوتانی گلۆپ، هیی هیتەری بۆیلەر، هیی فۆیلپەم، هیی ترۆمپا، جا هیی چیی نا؟ خۆیشم هەر بەدبەختەفەنیی فلیم سووتاوم! ڕەوەند ژمارەی فۆیلپەمگۆڕێکی گەڕۆکی لابوو و پێوەندیی پێوە کرد، کابرا دوای بیست دەقیقە گەیشتە لامان و چەند جۆرێکی فۆیلپەمی دەرهێنا و تێیگەیاندین کە ئەسڵییە ئەووەلبابەکە بە گۆڕینەوە حەفتا هەزار دیناری تێدەچێ، هەرچی ناوەنجییەکەیانە بە شەست هەزار و خراپەکەیش بە چل هەزار دەوەستێ، دوای مامەڵە کردن، پێکهاتین کە ئەسڵییەکەمان بە شەست و پێنج هەزار بۆ ببەستێت، ئەویش تا کارەکەی تەواو کرد نیو سەعاتی خایاند، کابرا هەر ستایشی جۆری فۆیلپەمەکەی دەکرد و دەیگوت: ئەم فۆیلپەمە، جۆری ئەسڵیی یەکەمە، لە خۆم زیاتر کەسیتر نییەتی.

بەم هەینییە، گوایە لەماڵەوە نایەمە دەرەوە، کەچی کە گەیشتینەوە ماڵەوە، نوێژی هەینییشمان چوو و سەعاتیش لە یەک لایدابوو.

# یاسینی لەیلووکهەژێن

یاسینی برادەری منداڵیم کە ئێستا لە دائیرەی کارەبا نۆبەتدارە، تەمەنی پەنجا و قسوور ساڵە، جاران پێمان دەگوت یاسین لەیلووکهەژێن، چونکە ڕۆژانی جەژن لە بنلەیلووکانی لای قەبرستانی چراغ شاگردە لەیلووکیی دەکرد و کە ئێمەی منداڵ سواری لەیلووک دەبووین، ئەو وەک با دەیهەژاندین، بەهۆی ئەوەی من لە مەکتەب و خوێندن یارمەتییم دەدا، ئەو منی زیاتر لەناو لەیلووکەکەدا دەهێشتەوە و هەمووجار کە سەردەکەوتمە سەر لەیلووکەکە، قاچێکم لەمسەر و قاچێکیشم لەوسەر دادەنا و دەستێکیشم بە لایەکی ڕایەڵی لەیلووکەکەوە دەگرت و دەستەکەی دیکەشم بە لایەکەی تریەوە و کە بەجوولە دەکەوتم، جیڕوهۆڕی کاریتەکانی لەیلووکوکەیان لێ دامەزرابوو ئەوناوەی دەگرتەوە و ترس و سامێکیان لە دڵاندا دەنیشتاند. ئەوەندە لێزانانە لەیلووکسواریم دەکرد، تا لێدەبوومەوە خەڵکێکی زۆر بەدیارمەوە دەوەستان. یاسین

بەنەوعێک لەیلووکەکەی ڕادەژەنی کە ئەوەندە بە توندی پاڵی بە تەنیشتە لەیلووکەکەیەوە دەنا، بە شێوەیەک خۆی لە ژێرییەوە لەودیو دەمنی پەلیکە دەهاتە دەرەوە و لەیلووکی لەسەر خۆی ئاودیو دەکرد و نەیدەهێشت لەیلووک بگاتەوە جێی خۆی، ئەو دەگەیشتەوە شوێنەکەی خۆی و بەمجۆرە بەردەوام دەبوو. ئێستا کە ناوەناوە بیر لە جوولە و بزێوییەکەی دەکەمەوە، وەختە بڵێم یاسین مانایەکی بۆ یاساکانی جوولە لە فیزیا نەدەهێشتەوە، یاریی بە چەقەهێزی کاریگەری سەر لەیلووکەکە دەکرد! دڵنیام گەر نیوتن مابووایە، ئێستا یاسای دیکەی بۆ جوولە و تاودان دادەڕشت. هەنووکەش بیرم لە هانکەهانکی هەناسەکەیەتی کە فشوهۆڕی با لە کونە کەپووەکانی وەک دووکەڵی مێشێ دەهاتە دەرەوە، کونە کەپووەکانی لە ماندووییان دەتگوت کونە دووربینن و لەدوورەوە ڕەش دەچوونەوە، ئەم وێنە سینەماییانەم  تا ئەوکاتەی شۆڕی ناو قەبرێم دەکەنەوە لە دید و هزردا ناسڕێنەوە. یاسین بەم شێوەیە ژیا و بەهۆی نەداریشیانەوە نەیتوانی مەکتەب تەواو بکا، هەر جارێ کە دەیبینم، کۆڵێ دڵم خۆش دەبێ، بەتایبەت وەختێ باسی کوڕەکانی دەکات کە یەکێکیان دوکتۆرای لە سایکۆلۆجی و ئەوەی تریان ئەندازیارێکی بەناووبانگی تەلارانە.

هەمووجار پێم دەڵێ: شوکور بۆ خوا موحتاجی نامەردان نیم و ئەو نۆبەتدارییەشم تا ئێرە هێناوە و ناشمەوێ لەم سێ چوار ساڵە خزمەتەی ماوەمە دەستبەرداری بم، بەڵام مامۆستا فەرهادی کە شینگ و تاقەت هەبوو ئێمە نەمانبوو، ئێستاش چەندی هەتبێ بە هیچ ناچێ!

# کوڕی بێوەژنێ

لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا کە پۆلی شەشی زانستیم تەواو کرد، نمرەکەم بایی ئەوە بوو لە کۆلیجی زانستەکان لە زانکۆی سلێمانی وەربگیرێم، ئەو کاتە باوکم تەواو کەوتبووە ساڵەوە و پیر و کەنەفتە بووبوو،ماڵمان لە خانوویێکی دووچاوەی یەک لە گەڕەکە کۆنەکانی عەربەت بوو، منی عەربەتیی، بۆ جارێکیش چەندە! سلێمانیم نەبینیبوو.

لەگەڵ حەمیدی ئامۆزام بۆ یەکەمجار، ڕوومکردە ئەو شارە، کە ئەویش لە کۆلیجی ئاداب لەوێ وەرگیرابوو. سەرەتا بەر لەوەی لە بەشی ناوخۆ ناومان بێتەوە، مانگێک لە چاوە خانوویێکی داتەپیوی مەڵکەندی دەژیاین، ئێوارەیەکیان لەگەڵ حەمید بەرەو بازاڕ شۆڕبووینەوە، لاتوپات و گیرفان نیمچە بەتاڵ تێی وەردەسووڕاین، گەیشتینە دەوروبەری مزگەوتی کاک ئەحمەدی شێخ و لەولاوە چەند پرووپیرەژنێک ماست و سەرتوێژ و قەیماغیان دانابوو دەیانفرۆشت، لێیان

نزیک بووینەوە و من دەمویست جامێ بچکۆڵەی ماست بۆ نانی ئێوارە بکڕم، پیرەژنەکان بە هۆی قسەوباسی نێو خۆیانەوە بەریان بە خەڵکەوە نەمابوو، زۆرم بەلاوە سەیر بوو! چما ئەم پیرەژنە سەرگەردانانە بۆ قسە هاتوون یان بۆ کار و کەسابەت؟ زیاتر لێیان نزیک کەوتمەوە تا بزانم لە چیی دەدوێن، دواتر گوێم لێیان بوو قسە و لفتیان لەبارەی کێچەوە بوو، یەکیان دەیگوت: من حەجمانم لەدەست کێچ نەماوە، ئەویتر بۆی دەسەندەوە: کێچ شەوێ نایەڵێ بەکامی دڵ بخەوم، لەولاتر پیرەژنێکی چاویلکە لەچاوی گۆچان لەپاڵ کە زۆر زیت و زرنگ دیار بوو، دەیگوت: نازانم کەی لەدەست ئەم کێچە پیسە قورتارمان دەبێت! مەراقمە بۆ جارێک کێچێک چەندە! بەدەست بگرم. منیش فزوولەن ویستم هەر بۆ شۆخی لەمبارەوە لەگەڵی بدوێم و لە بەرانبەرییەوە وەرامیم دایەوە:

پورێ گیان توخوا ناوت چییە؟ وەرامی دامەوە: من ناوم (گورجی) یە، بۆ؟ گوتمێ: پوورە گورجی گیان، دەبا من چارەسەریی ئەم کێچە لەعنەتییەت بۆ باسکەم، ڕێگایەک هەیە بۆ لەناوبردنی یەکجارەکیی کێچ، با بۆتی باسکەم.

هەستم کرد گەشانەوە بە ڕووخساری باجی گورجییەوە دەرکەوت و بە سەرسڕمانەوە تەماشای

دەکردم:

دا دەی ڕۆڵە گیان چۆن چۆنی؟

پوورە گورجی ئێوە لەماڵەوە خۆڵەمێش(مشکی)تان هەیە؟

ئەی چۆن نیمانە!

پوورە گورجی، تۆ هێلەگت بینیوە؟

ئەی چۆن بەساقە.

هێڵەگێک بێنە چەند مشتێ مشکیی تێکە.

ئێ ێ ێ ێ؟

ئینجا مشکییەکە لە بنی هێڵەگەکەوە بێنەوە.

ئێ ێ ێ ێ؟

بیخە ناو هێڵەگێکی وردتر.

ئێ ێ ێ ێ ؟

پاشان لە تافتەی بدە.

ئێ ێ ێ ێ ؟

ئینجا خۆڵەمێشە پۆدراوییەکە لەسەر دەسرێک ڕاخە.

ئێ ێ ێ ێ ؟

پاشان یەک یەک کێچەکان بگرە و پێلووی چاویان بکەوە و مشکییەکەی تێکە، بەمجۆرە کێچ تەواو دەبن و بۆ هەتاهەتا لە کێچ ڕزگارتان دەبێ .

هەستم کرد پوورە گورجی زۆر لێم دەهری بوو و تێگەیشت بە بەزمێکم بردووە!

بە سەر و ڕووخسارێکی پەشۆکاوەوە ڕووی
کردمێ و پێی گوتم:
بەساقە ە ە ە؟
وەرامم دایەوە: بەڵێ پووریێ گیان؟
پێی گوتم:
بە ساقەەە ە، توخوا تۆ کوڕی بێوەژنێ نیی؟

بیرۆکەی ئەم بابەتە بەسەرهاتێکە ماموستا غەریب پشدەری
بە جۆرێکی تر بۆی گێڕامەوە، لای من ئەم دەقەی لێکەوتەوە.

# ماجەرای دختۆر کاکۆی سەگەوان

لە شەڕی ناوەخۆی کوردستان، کە حیزبەکان هیچ نەما بە یەکتری نەکەن و تەنانەت درندەیی هەندێک لە چەکدارانی کورد بەرانبەر یەکتر، گەیشتە ئەوەی گەر یەکێکیان بە دیل لەلایەن حیزبە ڕکابەر و دوژمنەکەی گیرابا، لەو دیلانە هیی وایان تێدا بوو کە بە پریمز گونیان ئاگر دەدرا، ئەم ئازارە وەحشییانەیان لەناو خۆیاندا ناو نابوو (گونتەقێنی)، زۆر لەو دیلە داماوانە بەو هۆیەوە گۆڕبزر کران و ئێستایش داکوبابیان چاوەنۆڕی هاتنەوەیانن، تەنانەت جاری وا بووە زەلام بە نوێژی نیوەڕۆ لە جادە دەگیرا و دواتر تا هەتایە شوونبزر دەکرا، ئەو ڕۆژانە بیرم لەوە کردەوە کە من پیاوی چەکداری و شەڕوشۆڕ نیم، بۆیێ واچاکە چارەسەرێکی خۆم بکەم و بەو برە دۆلارەی پاشەکەوتم کردووە، خەمێکی پیاوانە لە خۆم بخۆم و باشترین چارەسەریش ئەوەیە بۆ دەرەوەی وڵات تێیتەقێنم و خۆم لەو

شەڕەسە و سەگوەڕەی نێوان هێزە سیاسییەکان قورتار بکەم، تا ئەوکاتەی لایەک بە لایەک دەبێ، چجای من کە لە حیزبێکم لە دونیادا پایدۆسی کردووە و مۆدێلی لە هیچ قوژبنێکی گۆی زەویدا نەماوە. ئەو حیزبەی من لێیم، جاران بە یەک فیکە دەیتوانی بە ملیۆن لە لایەنگر و هاوولاتییان بێنێتە جادە، کەچی ئەمڕۆ بە هەزار ناری عەلی پێی ناکرێ پازدە کەس کۆکاتەوە. بیرم دەکردەوە کە لەم ڕۆژگارەدا قەتوقەت بەهۆی حیزبەکەمەوە ناگەمە هیچ.. ئەوەبوو بۆ ڕۆژی دواتر خۆم و پاییزە ی هاوسەرم بڕیارماندا سەری خۆمان هەڵگرین و بۆ ئەوروپا هەڵێین. چەند ڕۆژ دواتر هەموو کەلوپەلەکانی ماڵەوەمان تەحسو نەحس کرد و بەشێکیانمان هەرزانفرۆش کرد و هەندێکیشیانم بەخشی، کتێبەکانیشم تەسلیمی ماڵی خەزوورم کرد و لە هەورەبانی ماڵەوەیان شوێنێکی تەقەتیان بۆ کردنەوە. هەفتەی پاشتر گەیشتینە سەر سنوور و چەند ڕۆژ دواتر بەو پارەیەی هەمانبوو، بەهۆی قاچاخچییانەوە زۆر بە زەحمەت گەیشتینە ئەوروپا. لە ڕێگا ئەوەندە بە پێ ڕۆیشتبووم، پێڵاوەکەم هەلا بە هەلا ببوو، ڕۆژانی سەرەتا کە لە بەلجیکا گیرساینەوە، هەستم بە نامۆییەکی کوشندە دەکرد و باری

دەروونیم خەریک بوو مێشکم تێکوپێک بدات، لا کولانەیەکیان دابووینێ و تێیدا دەژیاین، سەگ بە حاڵمان نەبووبێ، ناز و نیعمەتی هەولێر لە کوێ و ئێرە لە کوێ! هاتنە دەرەوەکەم لە کوردستان زۆری پەشیمان کردمەوە. بیرم دەکردەوە، باشە من بۆ وا لەخۆمم تێکدا؟ چما لەوێ لای خۆمان کێماسییەکم هەبوو؟ ئەندامێکی بەرزی حیزب و خاوەن پاسەوان و ماڵوحاڵێکی ئاوەدان و تا ڕادەیەک لە ناز و نیعمەت.

ڕۆژ هەبوو خەریک بوو لە دەردەسەرییان بتەقم. نیوەڕۆیەک دوای ئەوەی بە حاڵ توانیم پارەی پێڵاوێکی ئاسایی پەیدا بکەم و لەو دەوروبەرە ئەو خەمەشم لە کۆڵ کردەوە، خۆم و جلی شڕ و وڕ و پێڵاوی تازەم لە گەڕەکی جامخانەکان خەریکی گەڕان و سووڕانی بێهودە بووم، ئەو جامخانانەی کە ژنانی ڕووتیان تێدا ڕاکشاوە و چاوەنۆڕی موشتەریی بەزم و ڕەزمی سێکسین، من پارەیەکی وام پێ نەمابوو کە بەشی ئەوە بکا حەزی گڕگرتووی ئاگردانی نێوگەڵم دامرکێنمەوە، بەڵام زۆرجاران لەنێو ئەو کووچە و کۆڵانانە بۆخۆم نەفەسێکی پڕ چێژم وەردەگرت. ئەو نیوەڕۆیە لە لاکۆڵانێکی کشوماتدا ئەسعەدی برادەرمم ڕووبەڕوو بووەوە، کە لە مەکتەب پێمان دەگوت (ئەسعەد چلودوو

چلودوو). ئەسعەدم لە حەفتاکانەوە نەبینیبوو، ئەو کوڕی پیاوێکی خواپێداو بوو و لە ژیانیدا ساردی و گەرمیی نەچەشتبوو، زۆریش شارەزای ئەم وڵاتە بوو و زمانەکەیشیانی بە تەواوی دەزانی، ئەسعەد ساڵانێکی زۆر بوو هاووڵاتیی ئەوێ بوو. شەوەکەی لە مەیخانەیەکی شەومەستان دەعوەتی ئەو بووم و بەیەکەوە خۆشمان ڕابووارد و تا مڕ بووین هەڵمانقوڕاند. ئەسعەد بۆ ئەوەی لەو بێ پارەیی و بێکاری و لاتوپاتییەم ڕزگار بکات، ئەلهەقی پیاوانە هاتە دەست و توانیی بە هانامەوە بێت. ئەو دەیزانی کاتی خۆی من لە مەکتەب چەند زیت و زرنگ بووم، بۆیێ چەند پێشنیازێکی بۆ کردم کە یەکێکیان خوێندنی دوکتۆرا بوو و یەکی تریشیان پاسەوانیی سیفێکی پڕ لە سەگ بوو بە مانگانەیەکی باش، ساحێب سیف دەوڵەمەندێکی تورکی برادەری خۆی بوو. کۆڵێ خۆشحاڵ بووم بە دیتنەوەی ئەسعەد و خەریک بوو کەمێک لە خەمۆکییەکەم دەرەوبیەوە، بۆیە دەمودەست پێشنیازی دووەمیانیم پەسەند کرد و بۆ ڕۆژی دوایی بوومە پاسەوانی سەدان سەگی جۆراوجۆر، تووتکە سەگ و سەگی لمووز بەرانی و دێڵەسەگ و سەگی سیفەت تاژی و گەماڵ و گۆردەی گوێ شۆڕ و قەپۆز تەشوولەیی و سەگی قژن و سەگی کلک خەنەیی

و سەگی سەروگوێلاک پڕ مۆڕە و سەگی کلک قوت و دەیان جۆری تر، جاری وا بووە لەگەڵیاندا دەکەوتمە قرووسکە و کتومت وەکوو ئەوان دەحەپیم، ئێستاش باوەڕ ناکەم کەس هەبێ وەکوو من جوان بقروسکێنێ، حەپینەک دەحەپیم گەر تەماشات نەکردبام و تەنیا گوێت لە دەنگم بگرتبایە، هەر کتومت حەپەی گەمبۆڵەکانی پشدەر، ئەوەندە متووی سەگ ببووم کە زۆرجاران لەگەڵیان بە قسە دەهاتم و دەمتوانی لە هەموو مەبەست و حەز و خولیایەکیان بگەم. زۆرجار لەوێ بە تەنیا لاسایی سەگەکانم دەکردەوە و دەگەوزیم و یاریی سەیر و سەمەرەم لەگەڵدا دەکردن. ئێوارەیەکی کۆتایی هەفتەی یەکەمی کارەکەم لە گۆڕەپانی سیفەکە و لەنێو سەگەکاندا دەخولامەوە، ئەسعەدم لێ بەژوور کەوت و باسوخواسی خوێندنەکەمی لەگەڵ هێنامە گۆڕێ، منیش ڕام وابوو کە ناتوانم بخوێنم و کار بکەم، تاقەتی خوێندنم نەبوو و پرۆژەکەیم بەلاوە چیایەکی هەزار بە هەزار بوو، پاشان دوو ئیشیم بەلاوە زەحمەت بوو. ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی بخوێنم و بۆ هەندێش زانکۆیەکی بۆ دۆزیمەوە کە نە خوێندن و خۆ هیلاککردنی دەویست، نە پارە و پوولێکی وا کە نەتوانم دەستەبەری بکەم، وەعدیشی دامێ کە هەر کات پێویست بکات، هاوکاریم بکات.

ئەوەبوو یەکشەممەی دواتر چووینە سەرۆکایەتییەک لەو زانکۆیانەی کە ئێستا لێرە ناویان ناون زانکۆی علووج، ئەوکات لێرە لەم جۆرە زانکۆیانە نەبوون، کەچی هەنووکە پڕە لە زانکۆی ئەهلی و علووج کە قوتابییانی تێدا ساقیت نابن و شتێکیشی لێ فێر نابن، ئەی نابینی خەریکە لە کووچە و کۆڵانانیش کۆلیژ و بەشەکانی قانوون هەن؟ چما نەتبیستووە کۆلیژی قانوون لە بەحرکەش هەیە؟ هەمووجار حاجی حەمیدی ئامۆزام، شەکرە عەنتیکەکانی دەشکاند و دەیگوت بە شەرەفم شەق لە تەنەکە و حاویەی زبڵی بەر دەرگای هەر ماڵێک و تەنانەت لە قوونی کەر هەڵدەی، خەریجی قانوون دەردەپەڕن، جا چتۆ خەریج؟ خەریج بە شەرتی کڵۆڵی لە قانوون. کۆڵەوار و نەزان لە دەستوور.

سەرۆکی زانکۆکە زۆر پیاوانە پێشوازیی لێ کردین و هەر ئەو ڕۆژە ناوی خستمە نێو لیستی وەرگیراوان لە یاسای نێودەولەتی، ئاگاداریشی کردمەوە کە چاوێکم لێیان بێت و ناوەناوە بەسەریان بکەمەوە، من لەوە نەگەیشتم، پاشان ئەسعەد تێی گەیاندم کە پێویستە مانگێ یەک دوو جار دیارییەکیان بۆ ببەم. هەفتەی دوو ئێواران بۆ ماوەی سێ سەعاتان دەچوومە زانکۆی گۆڕین، هەفتەی سێیەمی دەوام کردنم بوو کە پرۆفیسۆری

سەرۆک بەش بەدوایدا ناردم و تێی گەیاندم کە پێویستە ناوونیشانێک بۆ تێزی دوکتۆراکەم دیار بکەم ، ڕۆژی دواتر لەسەر پێشنیازی ئەسعەد، ئەم ناوونیشانەم تەسلیم کردن (بارودۆخی دابەشکردنی کوردستان بەدەست کۆلۆنیالیزمەوە)، مانگێک دواتر پرۆفیسۆرێکی گەنجی ناو زانکۆکەمیان بۆ کردم بە سەرپەرشتیاری تێزەکەم کە لە ژیانیدا ناوی کوردستانی نەبیستبوو، ئەسعەد چاکەی ئەوەشی بەسەرمەوە بوو کە هاوکارێکی هەولێریی خۆی ڕاسپارد کە دەستی نووسینی هەبوو تا تێزەکەم بۆ بنووسێت. لەگەڵ هاوڕێ سەرپەرشتیارەکەم، زۆرجاران بەیەکەوە پیاسەمان دەکرد، تەنانەت جارجارە لە گەشت و سەیرانان بەیەکەوە تا مرۆ دەبووین دەمانخواردەوە و من نەمدەهێشت ئەو بە خەونیش هەست بە تەنکبوونەوەی گیرفانی بکات، بۆیە بوو بە هاوڕێیەکی گیانی بە گیانی و وای لێ هات کە زۆر هاتوچۆی ماڵەوەشی دەکردم، پێوەندییەکەمان هیی مامۆستا و قوتابی نەبوو، هەردووکمان شارەزای سرۆ و ترۆی یەک بووین، ئێستاش جارجارە وەک دۆستێکی دێرینی کورد و کوردستان لە لایەن بەرپرسە گەورەکانەوە، وەک میوانێک لە کوردستان پێشوازیی لێ دەکرێت، هەرکە بە میوانیش دێت، ئاگاداری منیش دەکرێتەوە

و بەشداریی دانیشتنەکانی دەکەم. ئێوارانیش لەناو سەگە خۆشەویستەکانم تا درەنگانی شەو و تا نۆبەتە پاسەوانیم تەواو دەبوو، خۆم دەخافڵاند. ئەمە بوو بەرنامەی ڕۆژانەی ژیانم تا ئەو کاتەی کە سڕەی دوکتۆراکەم هات، بۆیە ماوەی چەند ڕۆژێک لەگەڵ هاوکارەکەم خەریکی شتێک بووین، ناومانننا تێز. قەتم لە بیر ناچێتەوە، شەوی بەر لە بەخشینی دوکتۆراکەم کە هەمیشە ئەو جۆرە زانکۆیانە بەخشینی بڕوانامەکانیان بێ جەلسەی گفتوگۆ و هەڵسەنگاندن و ئیمزا و میمزا، بەڵکوو ئێوارەکەی لە ئاهەنگێکی کێک و میوە خواردن و سەما و مۆسیقادا بڕوانامەکان بە کۆمەڵ دەبەخشرێن و دوای فیکە و چەپڵە لێدان دەبێت بە دوکتۆر و ناوێ بێنە و دەستان بشۆ. شەوی دواتر کە دوکتۆرام وەرگرت، لە سیفەکەدا لەناو سەگاندا ئەوەندەم قرووسکاند خەریک بوو دەنگم دەنووسا، تەنانەت سەگەکان ناوەناوە بە سەر و ڕووخساری سوڕماوەوە تەماشایان دەکردم کە قەتیان وا نەبینیبووم. بیرمە ئەو شەوەی بوومە دوکتۆر، شەرەفخانی بەدلیسیم هاتە خەونێ و زۆری قەشمەری بە تێزەکەم کرد و ئامۆژگاریی کردم کە مێژووی بەرباد و شێواوییەکانی ناو تێزەکەم چاک بکەمەوە یان ئەوەتا دوای وەرگرتنی

بڕوانامەکە، تێزەکەم بشارمەوە و تا دونیا دونیایە نەیدەمە دەست کەس و نەیەڵم حەشتەبای خواش بیبینێ و قەتوقەتیش چاپی نەکەم، بڕواش ناکەم کەسێ لە کوردستان زمانی نووسینی تێزەکەم بزانێ تا بتوانێ وێرانە و قەشمەرجارییەکانی ناویی ئاشکرا بکات. لێگەڕێ با بڕوا و لە وڵاتی ئێمە دوکتۆرا یەعنی دوکتۆرا و بڕایەوە، ڕۆژەکەی بیرم کردەوە و بە خۆمم گوت هەی ئەحمەق، بۆچی خۆت بە خەون و خەیاڵانەوە خەریک دەکەی؟ هەی گەمژە؟ چما هەر کاتێ بچییەوە، بە دوکتۆر بانگ ناکرێی؟.

ئێوارەکەی تەحسینی برام تەلەفۆنی بۆ کردم و لە هەواڵی بڕوانامەکەمی پرسییەوە و گوتی هەڤالانی حیزب و هەموو خزم و دۆستان عەودالی هەواڵەکەن. ئەرێ چیت بەسەر هاتەوە؟ پێیم ڕاگەیاند کە تێزەکەم وەکوو خۆی و بە پلەی نایاب پەسەند کراوە، تەحسین داوای زانیاریی زێتری لێ کردم تا هەواڵەکە لە ڕۆژنامەکان وەک ڕووداوێکی مەزن و وەرچەرخێنەری بارودۆخ بڵاو بکاتەوە، ئەوەبوو هەفتەی دواتر هەموو ڕۆژنامەکان بە وێنەی ڕەنگینی خۆمەوە باسیان لە گرنگیی تێزەکەم بۆ دوارۆژی کوردستان و دەنگدانەوەی لە سەرتاپای گۆی زەوی کردبوو. بڕواتان هەبێ

کە تەحسین وێنەی هەواڵەکەی بۆ ناردم و دواتر کە خوێندمەوە، ئیستێکم کرد و هۆپەکم لەخۆم زانی! چما من ئەوەم کە میدیاکانی وڵاتەکەم باسم دەکەن؟ بۆیێ بڕیارمدا دوو دەستە قاتی پێرکاردن و دەستەیەک بۆینباخی نایاب و چەند قۆندەرەی پڕ باقوبریق و بۆنی مارکەی جیهانی و کەلوپەلی تر بکڕم و سەرەتای مانگی ئەیلوول بگەڕێمەوە و کارێک بکەم بە بایەخەوە پێشوازیم لێ بکرێ.

بەر لە گەڕانەوەم بە مانگێک دانەیەکی مۆرکراوی بڕوانامەکەمم بە هاوڕێیەکمدا بۆ تەحسین نارد تا تەسلیمی بەشی بڕوانامەکانی وەزارەتی خوێندنی باڵای بکات، بۆ ئەوەی مۆری بکەن و بە ڕەسمی پشتڕاستی بکەنەوە و بڕوای پێ بهێنن، مانگێک دوای ئەوە تەحسین تەلەفۆنی بۆ کردم و پێی ڕاگەیاندم کە لیژنەیەک لە وەزارەتەکە بڕوایان بە دوکتۆرانامەکەم نەهاتووە. بەویان ڕاگەیاندبوو کە ئەو زانکۆیەی بڕوانامەکەی داوە، زانکۆی جەڵەبی و بێ بڕوا و متمانەیە. کە ئەمەم بیست، لە داخان مووی سەرم ڕەپ ڕاوەستا و چاوم چووە پشتی سەرم. بیرم کردەوە کار وا بڕوات، ڕیسەکەم لێ دەبێتەوە بە خوری، ڕۆژی دواتر تەلەفۆنم بۆ یەک لە برا بەرپرسەکانی وەزارەتەکە کرد و ماوەی سەعاتێک مشتومڕمان

بـوو و دواجـار بڕوایـان نەهـات کـە دوکتۆراکـەم تـەواوە.

سـەروبەندی ڕێککەوتننامـەی واشـنگتۆن بـوو لـە نێـوان هـەردوو حیزبـی زلهێـز و هـەردوو لا بەڵێنیـان بـە هەڤاڵانمـان دابـوو کـە بـۆ پێکهاتـەی حکوومەتـی تـازە، لایـەک لـە ئێمـەش بکەنـەوە، بۆیـێ کاروبارەکانـی خۆمـم ڕێکخسـت و دە ڕۆژ دواتـر بلیتـی ئەستەنبۆڵم بڕی تـا لەوێوە بگەڕێمـەوە وڵات. هەواڵـم ناردەوە کـە سبەی سـەعات چـواری ئێـوارە دەگەمـەوە سـەر سـنوور. ئەوەبـوو لـە گەڕانەوەمـدا هەڤاڵێکـی زۆری خۆمـان لەسـەر سـنوور لـە پێشـوازیمدا بـوون و کـە چـاوم بـەم هەمـوو دۆسـتە ئازیـزە کـەوت، ماندوویێتیـم لەبیـر چـۆوە و ڕۆژی دواتـر شـەواهەنگێکی سـەرمەسـتانەیان بەبۆنـەی هاتنـەوەم و بەدەسـتهێنانی دوکتۆراکـەم لـە کۆشـکی قـەلا بـۆ ڕێـک خسـتم و تـا درەنگانـی شـەو لەگـەڵ حەشـاماتی هەڤـالان مایـنـەوە. چەنـد ڕۆژ دواتـر بڕیـاری بەرپرسـێتیی ڕێکخسـتنی حیزبیـان بـۆ دەرکـردم و نـاوم لـە سـەری سـەرەوەی هەمـوو نووسـراو و بڵاوکراوەکانـدا بـە پێشـگری (د.) دەنووسـرا و لـەوەوە کـەس بـە نـاوی خۆمـەوە بانگی نەدەکـردم. دوکتـۆر، دوکتـۆر نێرەکـەر نەیدەکێشـا.

ئـەو ماوەیـە زۆرم هەوڵـدا بڕوانامەکـەم بـە

ڕەسمی هاوتا بکەمەوە، بەڵام دوکتۆرێکی بەتەمەنی خوێندنی باڵا لێم لە ڕک ڕاچوو و سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەو زانکۆیەی دوکتۆرای داومێ، ناوی لە هیچ لیستێکی زانکۆ بڕوا پێکراوەکانی دونیادا نییە، بە کورتی تێی گەیاندم کە من بڕوانامەم لە دوکاندارانەوە وەرگرتووە، ئیتر دەستم لەو کارەم شووشت. لەو ماوەیەدا خەڵکانێکی زۆڵی زۆرزان بەو حاڵەیان زانیبوو و ناسیاویشم بوون و هەر بۆ فشە پێکردنم لە مەجلیسان بە دختۆر نەک دوکتۆر ناوزەدیان دەکردم و منیش لە مەرام و فیتەیان دەگەیشتم، بەڵام ناچاری خۆ لە گێلدانێ بووم.

وەزعە سیاسییەکە خەریک بوو ئارام دەبووەوە و شەڕی ناوەخۆ کە دەیگوترایێ براکوژی، خەریک بوو تا ڕادەیەک لە بیر دەچووەوە، ڕۆژێکیان لە سەرکردایەتییەوە تەلەفۆنیان بۆ کردم و گوتیان بڕیارمان داوە سبەی ئێوارە کۆبینەوە و چەند هەڤاڵێکیشم پێیان ڕاگەیاندم کە قسەیەک هەیە پشکێکی وەزارەت بەر حیزبمان بکەوێ و ئەوان لای خۆیانەوە منیان دەستنیشان کردبوو بۆ وەرگرتنی ئەو پۆستە و دایاننابوو لە کۆبوونەوەکەماندا بابەتەکە بێننە گۆڕێ، ئەو شەوە لە خۆشییان خۆم و پاییزە خەومان نەچووە چاو.

لـە کۆبوونـەوەی ئێوارەکـەدا باسـم لـە گرینگیـی بەرپرسـیاریتیی تـاک کـرد لـە کۆمەڵگەکەمانـدا و جەختم لـەوەش کردەوە کە پێویستە تاکی بەرپرس لەنێو ئێمـەدا بـەر لـە هەمـوو شـت لـە خەمەکانـی هاووڵاتییانـدا بێـت و لـە خزمەتیانـدا ڕاسـتگۆ بێـت و کار بـۆ چەسـپاندنی دیموکراسـییەت و ئـازادی بکات و خۆی لـە منمنۆکێ و خۆپەرستی بە دوور بگرێـت و ئەرکەکانـی سەرشـانی دوور لـە ناپاکـی و خیانـەت بەجـێ بێنێـت. قسـە و باسـەکانم بوونـە مایـەی سـەرسـامیی هەڤاڵانـی میـم سـین، پاشـان کـە قسـە هاتـە سـەر بەشـداریی کردنمـان لـە دەسـەڵاتی جێبەجێکـردن و هاتنـە سـەر کاندیدکردنـی یەکێکمـان بـۆ پۆسـتی وەزارەتـی داد لـە هەرێمەکەمـان، تێکـڕای هەڤاڵانـم بـە زۆرینـەی دەنگ منیان هەڵبژارد و منیش دوای منگەمنگێکـم کـە وام کـرد کـەس تێمنـەگات چیمـە، پاشـان ڕەزامەنـدی داواکەیـان بـووم. چەنـد ڕۆژێـک دواتـر کەناڵەکانـی ڕادیـۆ و تـی ڤـی و فەیسـبوک و ڕۆژنامـەکان لیسـتی کاندیدکراوانـی کابینـەی بنکـە فرەوانیـان بـڵاو کـردەوە کـە نـاوی بەندەشـیان تێدا بوو، ئەو ڕۆژە بـە سـەدان کـەس بە نامـە و تەلەفۆن و سـەردانی ماڵـەوەم، پیرۆزباییيان لێ کـردم و خۆشـحاڵییان بـۆ دەربڕیـم، خەڵکـی وام دەهاتنـە سـەردانێ کـە قـەت بیـرم بۆیـان نەدەچـوو،

لە کارمەندانی وەزارەتی داد زەلامی ملەستوور ملەستوورم لێ بە ژوور دەکەوت، جێگا نەمابوو گوڵی جۆراوجۆری هۆڵەندی و ئێرانی و گوڵی باغە و دەستکردی تێدا دانێم، چەند ڕۆژ دواتر چەندینیانم بەسەر دراوسێکاندا بەخشییەوە. لە ولاتەکەماندا فرۆشتنی پلە و پایە لە چرکەساتدایە، بۆیە منیش ترس و نیگەرانیی فرۆشتنەوەم و دەرکێشانم لە لیستەکەدا، هەناوی هەڵکۆڵیبووم و خەو و خۆراکم ببووە بیرکردنەوە و ڕاڕایی و مەرگەمووش، ئەگەرچی شتێکیشم لە کارگێڕی و قانوون نەدەزانی، بەڵام بیرم دەکردەوە و تەماشای ناوی کاندیدکراوان و وەزیرەکانی پێشووم دەکرد، خۆمم لا بە ئەفلاتوون دەهاتە بەر چاو، بڕواتان هەبێ خەڵکی وایان تێدا بوو توانای بە پێشەخۆدانی دوو سەر مەڕ و بزنێکیشی نەبوو.

دیسانەوە بەختەکەم هێنای و ڕۆژی پێنجشەممە ئاگادار کرامەوە کە سبەینەی یەکشەممە بۆ سوێند خواردن لە پەرلەمان بۆ ڕاگەیاندنی کابینەی تازە ئامادەبم کە تیایدا بەندە پۆستی وەزارەتی دادی دەدرێتێ. خۆم و قۆندەرەی زرۆقی و قاتی بە باقوبریقی شەو ئوتووکراوم و بۆینباخی مارۆنیم، بە پیکابەکەم بەرەو پەرلەمان ڕۆیشتم و لەوێ پۆلیسەکان ڕێگرییان لە چوونە ژوورەوەم کرد،

هەوڵمدا تێیان بگەیەنم کە من کاندیدی حیزبم بۆ بوونە وەزیر، کەچی هەر گوێیشیان پێ نەدام و تێیانگەیاندم کە بردنە ژوورەوەی پیکابەکەم کارێکی ڕێگە پێ نەدراوە، تەنیا ڕێگەی چوونە ژوورەوەی خۆمیان دا، بەڵام ناسنامەکەشیان لێ گێڕامەوە. دوای ڕێوڕەسمی سوێند خواردن بە قورئانی پیرۆز کە یەکەمجارم بوو لە ژیانمدا دەستم بەر قورئان بکەوێ، نیوەڕۆکەی دەعوەتی شاهانەی نانخواردنی سەرەکوەزیران بووین و دوای تەواو بوون، تەلەفۆنێکم بۆ سمکۆی ئامۆزام کرد کە بە دوامدا بێت، دواتریش هەر خۆی، پیکابەکە و ناسنامەکەی بۆ هێنامەوە.

ڕۆژی پێنجشەممە بوو، سمکۆ گەیاندمیە وەزارەتەکە و حەشاماتێکی زۆر لەبەر دەرگا لە پێشوازیمدا بوون، تەوقەم لەگەڵ یەکە یەکەیان کرد و بەرەو نهۆمی سەرەوە ڕێنیشانیان کردم و ئەو ڕۆژە بەهۆی زۆریی میوانانەوە تا دەوام تەواو بوو هیچم بۆ نەکرا، هەفتەی دواتر سەرۆکی حکوومەت چوار ئۆتۆمبیلی بەرزی تازە مۆدیل و دوو شوفێر و شەش پاسەوانیشی بۆ ناردم و هەموویان بە کڕنووش و دەستەوەستانەوە لە خزمەتمدا بوون و مانگێک دواتریش کلیلی خانوویەکی نوێی دوو دۆنمیی پڕ لە کەلوپەلی گەڕەکی وەزیراوایان بۆ ناردم کە

شوێن و ماڵوحاڵی سەرجەم وەزیران و بەرپرسە نەقۆڵاکانی حیزبەکان بوو، منداڵەکانیشمیان لە قوتابخانەی شووەیفاتی نێودەوڵەتی دانا بەر خوێندن. ژیانم کەوتە ڕەوتێکی تازەوە کە بە خەونیش بیرم بۆ ئەوە نەدەچوو ئەوە من بم!

یازدە مانگ بوو ببوومە وەزیر کە ڕۆژێکیان بەرپرسی کارگێڕیی ئەنجومەنی وەزیران، زەنگی بۆ لێدام و پێی ڕاگەیاندم کە بە هۆی گەشتێکی یەک مانگیی جەنابی وەزیری خوێندنی باڵاوە بۆ وڵاتانی دەرەوە، بە بڕیاری جەنابی سەرەکوەزیران، ئێوە ئەو مانگە کاروبارەکانی وەزارەتەکە دەگرنە ئەستۆ، ڕۆژی پاشتر بەڕێوەبەری نووسینگەکەم نووسراوەکەی بۆ هێنام: (بە هۆی سەفەرکردنی ڕێزدار مەغدید حەوێز سمایلاوە وەزیری خوێندنی باڵا، بڕیارماندا بەڕێز دوکتۆر کاکۆ حووجان ترپەسپیان وەزیری داد، بە شێوەیەکی کاتی و بە وەکالەت پۆستی وەزیری خوێندنی باڵاش وەربگرێت. ئیمزا: س. وەزیران)

ئەوەم زۆر بە دڵ بوو و ڕۆژی دواتر لە خوێندنی باڵا دەست بە کار بووم و تەواوی ڕۆژەکەم لەوێ بەسەر برد و کۆبوونەوەیەکم بە سەرجەم فەرمانبەرانی کرد و تێمگەیاندن کە ئەرکی ئەم وەزارەتە لە بەڕێوەبردن و پێشخستنی

وڵاتەکەمان لە ڕووی زانست و تەکنۆلۆجیا و هەموو ئەو هۆکارانەی کە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ پێوەندییان بە ژیانی تاکەکان و کۆمەڵگاکەمانەوە هەیە، زۆر پیرۆزە، بۆیە پێویستە هەر یەکەمان لای خۆیەوە بەوپەڕی لێبووردەیی و دڵسۆزی و ڕاستگۆییەوە، ماندوونەناسانە کار بکات، تکایە بەردەوام دژی دزێوی و گەندەڵکاری بووەستنەوە و ئێمەش وەکوو سەرۆکایەتیی حکوومەتە ساواکەمان سەربەرزین بە یەکە یەکەتان.. ئیتر بۆ پێشەوە.

ڕۆژێکیان بەڕێوەبەری گشتیی بڕوانامەکانم هاتە لا کە بڕیار بوو خۆم بە دوایدا بنێرم، دوای بەخێرهێنانی، بەر لەوەی قسە بکات و داواکاری و ئیشەکەیم بۆ باس بکات، شوفێرەکەمم تێگەیاند کە جانتا دیبلۆماسییەکەم بۆ بێنێ و تێزە بیست لاپەڕەییەکەم و بڕوانامەکەمم لێ دەرهانی و بە سۆفتە سەوزەکەم ئەم پەراوێزەم نووسی:
(بەڕێوەبەری گشتیی بڕوانامەکان.. تکایە بە پەلە و بێ دواخستن ئەم بڕوانامەیە هاوتا بکەن.. ئیمزا: و. خ. بالا)

شوکور بۆ خوا بۆ بەیانییەکەی بێ ئەوەی بیداتە لیژنە و میژنە، بڕوانامەکەی بە نووسراوی هاوتاکراوەوە دایەوە دەستم.

## چۆن بووم بە حەمید ڤان کوخ؟

زۆرم مەراق بوو ئەم دەسەڵاتە سیاسییەی پێشوو بگۆڕدرێت، کەچی ئێستا خەریکە پەشیمان دەبمەوە، ئاخر ئەوانیش زۆر خەڵکیان ئەزیەت دەدا و هیچ مافێکی هاووڵاتییان دەستەبەر نەدەکرد، تەنیا متووی دزی و بە تاڵانبردنی داهاتەکانی وڵات بوون و کە مامۆستا بووین، حسێبی سەگێکی تۆپیویان بۆ نەدەکردین، بۆیێ زۆرم ڕق لێ دەبوونەوە و خۆشیم بە چەهرە و بیچمی دزێویان نەدەهات. کە لەو دەشت و کێوانە دابەزین، دەتگوت بەرازن بیستانان دەڕنن، بەراز کە دەکەوێتە ناو ڕەز و باخان، هەرچیی ساغە بەپێوەی ناهێڵێ، ئەمانیش وابوون، گۆرییە جێ پەنجە کونەکانی خۆیان لەبیرچۆوە و فێری ناوی مارکە جیهانییەکانی بۆن و قات و قۆندەرە و تیشێرت بوون، یەکسەر کەروباریان کردن بە جوانترین مۆدیلی فۆرد و مارسیدیس و دۆج. بۆیێ ڕقمان لێ دەبوونەوە، دەنا بە بەراورد بەم ڕدێن مووچکە سەگانە، خەریکە لە هۆرژنی

گریانـێ دەدەم و دەڵێم  دەک هـەزار ڕەحمەتـت لـێ بـێ کفـن دز.

ئاخر ئەو ڕدێن تەپشـوولانییانە، سـمێڵ قووتی دەلینـگ هەڵکشـاوی ناشـیرینن، ئـەرێ بۆنـی دەمیـان بـۆ وا گەنیـوە؟ تـۆ بڵێـی بزانـن ددان شـووشـتن چییـە؟ هـەر هەمـوو شـتێکیان بـەلاوە حـەرام و گوناهـە، چـۆن زەندەقـم لێیـان نەچـێ؟ گوتیـان خواردنـەوە حەرامـە، گوتمـان ئامەننـا، ئەگەرچـی زۆر خەمبـار نەبـووم، بەڵکـوو تەنیـا مانگـی جـارێ لـە یانەکـەی فەرمانبـەران خـۆم و چەنـد نەگبەتـێ بـە خۆشـییەوە خەمەکانمـان بەبـا دەکـرد و تـا مـڕ دەبوویـن هەڵماندەقوڕاند، ئەوەشـیان ڕۆیـی، کەچـی ئێستا خەریکە هەمـوو شـتێکی جوانمـان لـێ دەدەنـە بـەر بڕیـارە دزێوەکانیـان گوایـە حەرامـن.

- جـا ئوتووکردنـی جلوبـەرگ کـەی لـە کتێبـە پیرۆزەکانـدا بـە حەرامـی هاتـووە؟
- ئـەی قـژ داهێنـان چ پێوەندییەکـی بـە ئیرتیـداد و میرتیـدادەوە هەیـە؟
- توخـوا وڵات هەیـە لـە دونیـادا شـانەی قژی تێدا مەمنـووع بـێ؟

زۆر سـەیرە هەرچیی دێ دەمانخێوێنێ!

ئـەوە مانگێکە بۆیـەی قژیـان قەدەغـە کردووە، چ کون و قوژبنێکـی ئـەم شـارە نەمـا بـۆی نەگەڕێم، چابـوو ئەمجـارە سـدیقەفەندیی نۆغەرانـێ بـە هانامـەوە هـات و تیووبێکـی ڕەنـگ کردنـەوەی قژی

دامیٰ، باش بوو ئەمجارەشیان چەرموویی قژمم لە کۆڵ کردەوە، ئەی بۆ جارێکی دیکە چیم چارەیە؟

مانگێک دواتر خەریک بوو تەواوی قژم ڕەنگی بەفر داگریٰ، ئێوارەیەکیان بۆی هاتمە دەرەوە تا پاکەتێک لە هەرجۆرە بۆیەیەک بێت لەم شارە زل و زەبەلاحە پەیدا بکەم، ئیٰ ئاخر ئەوانە وا بۆ ساڵێک دەچیٰ دینارێکی خانەنشینییەکەیان نەداوینەتیٰ، زۆر سەیرە، جاران دەمانگوت، ئەوان مووچە نادەن و دەمانچەوسێننەوە، ئاخر بەڕاستی لە تامێیان دەرکرد. لە دەرکی قەیسەری تووشم بە تووشی (شەمە دمبرلۆز)ی هاوڕێی دێرینم بوو کە چەند مانگ بوو نەمبینیبوو، خەریک بوو نەیناسمەوە، شەمە زەلامێکی کەتەی وەرزشوان بوو و برادەری جارانی یانەی فەرمانبەرانم بوو، دین و دیانەت بەلایەوە بایەخێکی نەبوو، ئەو قەت نەیدەهێشت تاڵێکی قژە بۆزەکەی بەلای سپیپاتییەوە بڕوانیٰ، وەستای ڕەنگکردنەوە بوو و ناوی ئەنواع و ئەشکال بۆیەی قژی دەزانی، کەچی ئەمڕۆ شەمە بەو سپێتییەی قژیەوە دەبینم. سەردەمێکی سەمەرەیە! توخوا ئاخر بۆیەی قژ بۆ مەمنووع بیٰ؟ ئەریٰ هیی هەندێە پیاو شەش مانگی لە پایین پیٰ بچێتە ژوورەوە؟ سەرم لەبن گوێی شەمە نا و گوتم:

شەمە، بزانە قەت عیلاجێکم بۆ نابینییەوە؟

گوتی: هاااا مامۆستا حەمید چیتە؟ من لە

خزمەتتدام.

توخوا شەمە گیان تیووبێ بۆیەم بۆ پەیداکە، شەمە گیان دونیا مەرگ و مردنە، قەت نامەوێ بە قژی چەرمووومەوە سەر بنێمەوە، شەمە منت لە بیرە؟ توخوا قەتت بەم بێزەوەرییە دیوم؟ بریقەی قۆندەرە و لووسوپووسیی جلوبەرگ و بۆنی خۆشی منت نایەتەوە یاد؟

شەمە لێی بادامەوە تومەز عەقڵی بۆتە عەقڵی کێشکەی سەر سواندووکان. ئێ ئاخر من چوزانم، شەمەی زەندیق لە ئەستەغفیروڵڵایێ دەدات و باسی حەرام و حەڵاڵیم بۆ دەکات، داخێکی زۆرم لێی خوارد و هەر بە پەلەپەل خۆیم لێ قورتار کرد.

ئەو بازارە گەڕام سەری دۆستە دوکاندارە نزیکەکانیشمم دا، کەچی بۆیەم دەست نەکەوت و نەکەوت. بۆیەی قژیان لێ کردبووینە حەشیشە و تلیاک، بەو خودایەی بێ شەریک و لامەکانە، ئەوانت ئاسانتر دەست دەکەوت.

شەو لەسەر دۆشەگەکەم وەرکەوتبووم و داڵغەی بۆیە و بیرکردنەوە لە چۆنییەتیی پەیداکردنی خەریک بوو مێشکم کونبەدەر بکات، هەر بیرم کردەوە و لە خەیاڵی سەیر ڕادەچووم و یەکسەر حسقیلی حامیدە بنجووم بیرکەوتەوە کە خمچییەکی ناوداری سییەکانی هەولێر بوو. بەیانییەکەی سەردانی ماڵەوەیم کرد کە کەوتبووە

بەرانبەر مەزارەکەی سەعدووناوا.

حسقیلم لەمێژ بوو نەدیبوو، ئەو کاتی خۆی لە مەکتەبی (ئەربیل ئوولا) هاوپۆلم بوو، دواتر بەهۆی تەنبەڵییەوە وازی لە مەکتەب هێنا و لەگەڵ بابی لە دوکانەکەیان لەناو خمچییەکان کەوتە کار، دواتر چەند ساڵێک بەر لە ڕاپێچ کردنی جوولەکەکان، بابی لە دین وەرگەڕا، ئەو تا ئێستاش هەر خەریکی خمکاری و خمچێتییە. گەرمای ئاب بە هانکەهانکی خستبووم.

حسقیل چاوی پێم کەوت، گەشایەوە و بردمیە ژوورەوە و جامە ئاوێکی کەدینەکەی بۆ هێنام. ئاوە فینکەکەم لە گەروو ئاودیو بوو و باسی بۆیەی قژم لەگەڵیدا هێنایە گۆڕێ، حسقیل سەری سوڕما و نەیدەزانی چۆنم وەرام بداتەوە! ئەو دەیگوت: برایێ من، ئەو خمەی من هەمە هیی خام و جورجێت و کودەری و ئەنگۆرە و سووف و بازە و چیت و کشمیر و خوری و جۆری دیکەی قوماشە، دەترسم بڕەکۆکەکت بدەمێ ئەو قژە خاوەت بسۆتینی، یان وەک قوماشی داڕزاوی عەمباران، قژت ببێتە عەمبارەسۆت و ئەوەندەی هەتە، ئەویشت نەمێنێ. نا نەخێر چارەی تۆ لای من نییە، بەڵکوو دەتنێرمە لای یووسف یاقوو کە بندیانێکی لێزانی گەورەی ڕەنگ و بۆیەیە و مامۆستای ئەو زانستانەیە کە پێی دەڵێن کیمیک.

ماڵی یووسفم لە کۆلانی عارەبان دیتەوە کە

دەکەوتـە پشـت مزگەوتـی مـەردان پاشـا. یووسـف لەمن بـە تەمەنتر دیاربوو، نەیدەهێشـت تاڵە مووێکی سـپیی قژە گروازەکـەی سـەردەربێنێ، بۆیەکـەرەوە و بۆیەگرەوەیەکی مەعلان بـوو، کـە باسـەکەم لەگەڵـی کـردەوە، وەرامـی دەمودەسـتی هەبـوو و بەلایـەوە کارێکی ئاسـان بـوو و ڕێگـە چارەیەکی شـیاوی بـۆ دانـام، بـە مەرجـی ئـەوەی لای کـەس باسـی نەکـەم. ناردمیـەوە لای حسـقیل و جۆرکێکـی یـەک وەقەیـی پڕ خمـی ڕەشـم لای هێنـا و گەڕامـەوە لای یووسـف و ئەویـش چۆنییەتیـی گرتنـەوەی بۆیەکـەی جـوان جـوان بـۆ ڕاڤـە کـردم:

حەمیـد گیـان گـوێ بگـرە، هەمـوو کیسـەکانم لەسـەر نووسـیون، پێویسـتە قاپێکـی بەتاڵـی قـوڕ بێنـی و دوو مسـت لـە خمەکـەی حسـقیلی تێبکـەی، پاشـان ئـەم کیسـانەی کـە ماددەی کیمیاییـی جۆراوجۆریـان تێدایـە، دێنـی و بایـی یـەک کەوگیـر لـەم بۆیـە کانزایـەی کـە لەسـەری نووسـراوە خوێـی قورسـی کانـزا تێدەکـەی، پاشـان بایـی دوو کەوگیـر لـە پارافینیلیـن (پـی پـی دی)، پاشـتر یـەک مسـت سـرکەی قورقوشـمی تێکـەڵ بـە کبریتـی تێدەکـەی. بـە برایـێ خـۆم بلێـم، دواتـر گۆلمێـک لـە خوێـی بزمۆسـی تێدەکـەی، ئینجـا ئۆکسـیدی ئاسـن و کاربۆناتـی مەگنیسـیۆم و ئۆکسـیدی ئامۆنیـا و مەنگەنیـز و کبریتاتـی سـۆدیۆم هەریەکەیـان بایـی کەوگیرێکیـان تێدەکـەی، پاشـان جامیلکەیـەک لـە

هەریەکە لە هاڕاوەی ڕەژووی ناو پاتری و تۆزی ورد و ڕنراو لە تایەی لەکارکەوتووی ترومبێل و چنگێ لە تەنیی بن مەنجەڵی دانووی تێدەکەی، شەش جامە ئاوی تەواو کولاویش دێنی و هەموویان دەگریەوە و بە دەوەخاکەناسی بچووک تێکەڵوپێکەڵیان دەکەی و بۆ ماوەی سەعاتێک دەیانخەیە سەر ئاگرێکی کز، پاشان دەیهێنییە خوارەوە و تا بەیانی لە هەیوانەکە جێی دێڵی، بۆ بەیانییەکە گیراوەکە دەخەیتە ناو شووشەی گەورەی سەر گیراو، پاشان دەتوانی بە شانەی دار، ئی جارانی خۆمان کە ئێستا دەست ناکەون، بۆخۆت بەکاری بێنی.

ڕوپییەکم دایە یووسف بندیان و خۆم و زەمبیلی پڕ لە کیسە کیمیام، بەرەو ماڵ بوومەوە. یووسف چۆنی گوت وامکرد، شووشە گەورە سەرگیراوەکانم هێنان و لە هەیوانەکەم بەجێهێشتن. خەریک بوو پاڵدەکەوتم، ئەو ڕۆژە زۆر ماندوو بووبووم، کە پاڵکەوتم، خەریکی وەنەوزدان بووم و لە چرکەساتی خەوبردنەوەم، لە دەرگاکە درا، کە کردمەوە، شەوکەتی برازام خۆی پەستایە ژوورەوە و پێی ڕاگەیاندم کە سبەی بۆ ئێوارەکەی لە ئەگلەنجەی کوڕەکەی ئامادە بم. پێی گوتم بە دزییەوە دەیکەین و بۆ چەند کەسێکی تایبەتە. پیرۆزباییم لێی کرد و خۆشحاڵیی خۆم نیشاندا و ڕازیبوونی خۆمم بە چوونە بۆنەکەیان بۆ

دەربڕی. دوای نیوەڕۆی ڕۆژی پاشتر، خۆم بە بۆیەکردنەوەی قژی چەرموومەوە خەریک کرد، کە بەڕاستی شێوازێکی هیلاککەر و ئەرکێکی زۆر بوو بۆ من، تا لێبوومەوە، هەموو شانوپیلم کەوت، دواتر ڕوومکردە باخچەکە و بە چاوەنۆڕیی وشکبوونەوەی بۆیەکەوە کەوتمە دالْغە لێدانەوە، لەو ماوەیەدا دالْغە خەریک بوو تەواوی ژیانم بگرێتەوە.

عەسرێکی درەنگ بە قژی قەترانیمەوە بەرەو مالْی شەوکەت هەنگاوم نا کە تەواوێک لە دەرەوەی شار بوو و لەوێ بە شەوق و زەوقێکی زۆرەوە پێشوازییان لێ کردم و چەند دۆستێکی خۆمم لەوێ دیتنەوە و شادمان بووم بە دیداریانەوە، حەوشە گەورەکە لە خەلْکانی شارستان و دونیا دیتە و ڕۆشنبیر جمەی دەهات و نزیکەی شەست حەفتا کەسێک دەبوون، گوایە ئاهەنگەکەیان بە دزییەوەیە نەوەکا بزانرێتەوە، چونکە ئاقیبەت خراپ دەکەوێتەوە، تینی گەرماکەش هەمووانی هەراسان کردبوو. کاریگەریی گەرماکە خەریک بوو لە پێستی خۆمم بێنێتە دەر، هەستم کرد بەخۆم و چاکەتەوە، شەلاّلی ئارەقە دەبووم، دەستێکم بە هەنیەم داهێنا، بینیم ڕەشکاوێک لە خم و ڕەژوواو تەواوی سەر و ڕووخساری گرتووم، بەرەو لای سۆندەیەک چووم کە لە دوورەوە دیار بوو و کەمێک سەروگوێلاک و

دەموچاوم دایە بەر ئاو و گەڕامەوە، هەستم کرد خەڵک بە لاچاوێکی سەیرەوە تەماشام دەکەن و لەگەڵ یەکتردا دەکەونە پستەپست و پێکەنین، ئارەقە تەواوی لەشی داگرتبووم، تک تک بە پشتی ملمدا دەچووە خوارەوە، ناچاری فڕێدانی چاکەتەکەم بووم و بینیم لە دواوە قاقای پێکەنینیانە و ئاوڕێکم دایەوە، هەستم کرد لە دواوە بە ڕەشایی و پەڵە و پیسیی کراسە سپییەکەم پێدەکەنن، بەسەرخۆم نەهێنا و کراسەکەشم داکەند و تەماشایەکی لای پشتەوەیم کرد، بووبوو بە یەک پارچە ڕەشاوی پەڵەپەڵەداری پڕ لە خاڵی زەرد و مۆر، دەتگوت نەخشی گیراوەی فنجانە قاوەکانی جارانی دایکی ڕەحمەتیمە، ڕەشاو ڕووخساری نەهێشتبووم، ڕەشاوی تێکەڵەی ماددە جۆراوجۆرە کیمیاییەکان و زفت و قیڕ و هاڕاوەی ڕەژوو تک تک بە دەموچاومدا جۆگەلەی دەبەست، کراسەکەم کەوتبووە دەست یەکدوو چاوەش کە بۆ هەڵپەڕکێ هاتبوونە ئەو ناوە و دەیانڕوانیێ و خەریکی پێکەنین و گفتوگۆ بوون و گوێم لێ بوو دەیانگوت نەخشی کراسەکەی حەمیدەفەندی کتومت تابلۆکانی ڤان کوخن، پێکەنین و قاقایان لە هەرچوار لاوە دەبیسترا، حەمید ڤان کووخ.. ڤان کووخ، بانگیان دەکردم.

بە پەلە گۆچانەکەم دایە بەر خۆم و تا وزەم تێدا بوو تەکانمدا و ئەوناوەم جێهێشت، لە لاکەی

تـرەوە خزمەکانیشـم بـەم بەزمـە قاقایـان دەهـات. سەرسـەرییەکانی ئـەو نـاوەش تـا لـە چـاوان بـزر بووم، هـەر هـاوار هـاواری حەمید ڤان کوخیان بوو. لـەویَ ڕۆژێـوە نـاوی حەمیـد ڤـان کوخـم بەسـەردا سـەپا.. کـە دەرگای ماڵـەوەم کردەوە، یەکسـەر خـۆم لـە گەرماوەکـە پەسـتا و بـە تەشـتان ئـاوم دەکـردە سـەر خـۆم و جۆگەلـەی خـم و ڕەشـکاو بنـی نەدەهـات و نەدەبڕایـەوە.

## شاکر شەمشوون

شاکر شەمشوون لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی لە تەنیشتم دادەنیشت، ئەو بە کەلەش لە هەموومان زرپەستوورتر بوو و کەسی نەدەوێرایێ، شەڕی بە دار و بەرد دەفرۆشت و بەردەوام لەگەڵ تری خۆی شەڕوشۆڕی بوو، ئەوەندە هاروهاج بوو، هاوتەمەنانی ئەوکاتی لە کۆڵانی عارەبان ناسناوی ,شەمشوونیان لەقەبەڵ خستبوو، شاکر کوڕی قۆنتەراتچییەک بوو و ئەوکات ڕۆژانەی ئێمە پێنج فلس بوو، ئەو هەموو ڕۆژێ سەت فلسی دەدرایێ، سەت فلسە گەورەکەی کە لایەکی دروشمە پرشنگدارە شێوە ئەستێرەییەکەی کۆماری عیراق و لایەکەی دیکەی وێنەی گوڵە گەنم و گوڵە جۆیەکی لەسەر بوو. شاکر لەماڵەوە لەسەر دەستان ڕاگیرابوو، ماڵی لەناو قەسران بوو و ڕۆژانە مام ڕەمەزانی شوفێری تاکسی دەیهێنا و کە دەوامیش تەواو دەبوو دەیبردەوە.

شـاکر قوتابییەکـی زیرەکیـش بـوو و زۆر کەیفیشـی بـە مـن سـاز دەبـوو و ئەوکاتیـش وەک مـن شـیعری کوردیـی زۆر لەبـەر بـوو و لـە پشـووی نێوان دەرسـەکان لـە مـن جیـا نەدەبـۆوە، لـەو سـاڵییەوە کـە دەیکـردە نزیکـەی بیسـت سـاڵی خشـت لەمەوبـەر کـە مـن و عەبدولڕەزاقـی بـرام لـە دەسـت هەندێـک لـە مامۆسـتا غەددارەکانـی قوتابخانەکەمـان، سـەری خۆمـان هەڵگـرت و چووینـە قوتابخانـەی هەلگـورد، مـن شـاکرۆکم نەدیتـەوە و تـا ناوەڕاسـتی نەوەتـەکان و لێـم بـزر بـوو، ئێوارەیەکیـان شـاکرم لـە تەیـراوە لای تەجنیـدە کۆنەکـە دیتـەوە کـە لەسـەر عارەبانەیـەک خەریکی پاقلاوە خواردن بوو، ئـەوکات مـن شـەش سـاڵ بـوو خوێندنـی کۆلێجیشـم تـەواو کردبـوو و بێپـارە و لاتوپـات بـووم و ڕۆژ هەتـا ئێـوارە لـەم کـۆڵان بـۆ ئـەو کـۆڵان تێـی وەردەسـووڕام. خەڵـک بـە گشـتی ئـەوکات بـێ پـارە و نـەدار بـوون، بـەڵام شـاکر بەڕکـی پـڕی پـارە بـوو. شـاکر بـە خورتـی پاقلاوەشـی دەرخـوارددام. لێـم پرسـی:

- شەمشوون گیان ئێستا چ کارەی؟

- گوتی: کاری چی؟ هیچ ئیش و کارم نییە.

خەڵـک ئـەو سـاڵانە بـە لێشـاو لـە کوردسـتان هەڵدەهاتـن و سـەرەڕۆیانە بـەرەو وڵاتانـی ئەورووپـا

ڕێی هات و نەهاتیان هەڵدەبژارد و تێیان دەتەقاند، من وەک ئێستام نەبووم و ئەوکات و ئێستاش قەت مەراقم چوونە دەرەوە نەبووە.

گوتمە شاکر:

ئەو خەڵکە وا ڕوو لە وڵاتان دەکەن، خێرە جەنابت ناڕۆی؟خۆ پارەشت زۆرە.

شاکر وەرامی دامەوە:

بۆ کوێ؟

گوتم: مەبەستم خاریجە.

شاکر شەمشوون سەرێکی بادا و وەک بڵێی بە گێلم تێبگات. گوتی گوێ بگرە برایێ خۆم:

من لە سەرەتای ڕاپەڕین چوومە سوید و چەند مانگێک لەوێ مامەوە، کەچی نەحەوامەوە.. قسەکەیم بەلاوە سەیر بوو.

گوتم: باشە سەبەب؟

گوتی کاکە گیان، ئاوڕەحمانی برا، سەگ لە قەسابخانەی نەمری عومری بە خەسارە. چما نازانی سیسرکە لە ئاودەست بهێنرێتە دەرەوە، دەمودەست ژانەسەر دەیگرێ؟

دەبا لەبارەی هەندێ، چیرۆکێکت بۆ بگێڕمەوە. شاکر شەمشوون دەستی کرد بە گێڕانەوەی چیرۆکەکەی: شاعیری فارس سایب تەورێزی کە چوار سەت ساڵێک لەوەبەر لە

سەردەمی سەفەوییەکان ژیاوە و شا عەباسی دووەم ناسناوی میری شاعیرانی دایێ، چیرۆکێکی هەیە کە دەڵێ: نێرەکەرێک لە گوندێک هەبوو، خاوەنەکەی و کەسوکاری و خەڵکی گوندەکە زۆریان ئەزیەت دەدایە بەر، لە مەلا بانگدانەوە خاوەن ماڵ بە قامچییان لەسەر پشتی بوو تا درەنگانی شەو، دەیبردە سەر بیر و دەولکی ئاوێی تێدەخست و ئاوی نیوەی گوندەکەی لە بیر پێ رادەکێشا، پاشان دەیبردە قەسەران، ئینجا سەر جۆخین و مۆخین و پووشبارکردن و تەپاڵە و مەپاڵە و ئیشوکارێکی یەکجار زۆری پێ دەکرد و بەردەوامیش وەریدەگەڕایێ و قامچییەکەی لە پشتی نەدەکردەوە، رۆژێکیان کەرەکە بیری کردەوە واچاکە تەگبیرێ لە خۆی بکا و لەو ژیانە نالەبارە، خۆی رزگار بکات، ئەوەبوو بەیانییەکیان زۆر زوو بەر لە مەلا بانگدان کورتانەکەی فڕێدا و قەراسەکەشی پساند و لە خانەکەی هاتە دەرەوە و گوتی واچاکە روو لە گوندێکی تر بکەم، ژیانی من لێرە نەماوە. ئەوە بوو هەڵتەک هەڵتەک ملی رێی گرتەبەر و بۆ ئێوارەکەی گەیشتە گوندێکی تر کە بەهارێکی خۆش بوو و هەموو دونیا کەسک دەچۆوە، لە خۆشییان هەر زەرِوهۆڕی بوو و بێ مناسەبە لووشکەی

دەوەشـاندن و مشـوهۆڕی هەناسـەی وای لـە کونـە کەپووەکانـی کردبـوو کـە تێـر هەڵمژینـی بـای بەهـارێ نەدەبـوو، لـە گوندەکـە کەوتـە باخچەیـەک تێروپڕی خـوارد و تـا خـاوەن باخچەکـە گرتییـەوە و بـە نـاز و نیعمەتـەوە حەواندییـەوە، هیـچ کـەس ئیشـی پـێ نەدەکـرد، جاروبـار قەڕاسـەکەیان دەکـردەوە و پیاسـەیان پـێ دەکـرد، لـە خـواردن و قەرسـەقولڕین بـەولاوە، نـە ئیش نـەکار قـەت هیچـی نەبـوو، ببووە دابەسـتەیەک تـا دەهـات قەڵـەو دەبـوو، کـەرە تەندروسـتییەکی یەکجـار باشـی هەبـوو و بـەردەوام لـە خۆشـییان زەڕوهـۆڕی بـوو. ڕۆژگارێ وا بەسـەر چـوو، وردە وردە خەریـک بـوو لـەو ژیانـە پڕ ئاسـوودەیی و پڕ جۆ و ئالیک و لووشـکە وەشـاندن و زەڕینـەی بێـزار دەبـوو، کـەس نەبـوو ئیشـێکی پـێ بـکات، ئیتـر ڕۆژگار هـات و ڕۆژگار ڕۆیـی، کـەرە ئالیکـی وردە وردە کـەم دەبـۆوە و هەسـتی کـرد کـە لـە ڕووی دەروونییـەوە نالەبـار و پەشـێوە، خـەوی هـوردە هـوردە کـەم دەبـۆوە و بـەردەوام بیـری لای خاوەنـی پێشـووی و کۆڵبـاری و ژانـی قامچـی و گوندەکـەی جارانـی و زێـد و مەفتەنـی بـاب و باپیرانـی بـوو، ئـەوە بـوو بڕیاریـدا کـە شـوێنە تازەکـەی بەجـێ بێڵـێ و بڕواتـەوە گوندەکـەی خـۆی و بچێتـەوە لای خاوەنـی جارانـی.

سبەینەیەک لەگەڵ مەلا بانگدان قەڕاسەی پساند و بەبن سیم و میمان ئاودیوی دەرەوە بوو و هەڵکوت هەڵکوت بەرەو زێدی خۆی ڕۆیشتەوە.
کەرە لەڕێ تووشی نێرەکەرێکی وەک خۆی بوو و لێی پرسی:
هاااا برالە خەریکی چیی؟ ئەوە بۆ کوێ دەچی کەرە گیان؟
کەرەی تر وەرامی دایەوە:
بەخوا برا گیان من بڕیارم داوە لەم گوندە هەڵێم، چونکە بەردەوام ئیشی یەکجار قورسم پێ دەکەن و ئیهانەم دەکەن و زۆرم لێدەدەن و قامچییان لە پشتم نابێتەوە و منیش ئەو سەرشۆڕی و ئێش و ئازار و نامەردییەم پێ قەبووڵ ناکرێ، بۆیە دەڕۆم و سەر هەڵدەگرم بۆ گوندێکی تر و نامبیننەوە، با بزانم چۆن دەبێ.
کەرەی پەشیمان و گەڕاوە وەرامی دایەوە:
برایێ خۆم بە قسەی من دەکەی وەرە وەک من بکە و بگەڕێوە گوندەکەی خۆت، سوور دەزانم پەشیمان دەبییەوە، من ئەزموونم هەیە و لەو گوندەی من پەنام بۆ برد هیچ هەستم بە کەرایەتیی نەدەکرد و ئەو حاڵەش بۆ ئێمە دەریناهێنێ ئێمە گەر هەست بە کەرایەتیی نەکەین چۆن دەژین چاوەکەم؟

ئەوجا ئاورەحمان گیان منیش لەو شارە بچمە دەرەوە هەست بە کەراتییەکەی خۆم ناکەم و لەوانەیە بتۆپم و هەلا هەلا بم.

هەردووکمان دامانە تریقەی پێکەنینێ.

شاکر شەمشوون سوێندی خوارد دەبێ پاقلاوەیەکی تریش بخۆم.

ناچار پاقلاوەیەکی تری شیرین وەک قسەکانیم خستە دەمم.

*چیرۆکەکەی سایب تەوریزی لە ڕۆمانێکی عەلی بەدر بەناوی عازف الغيوم بەجۆرێکی تر خراوەتە ڕوو.

# ئەسعەد چلودوو چلودوو

ئەسعەد کوڕی خواپێداوێکی دراوسێی دەرکە بە دەرکەمان بوو، کە لە قوتابخانە بەیەکەوە بووین، هەموو دەم پاک و پۆشتە بوو و ڕۆژانە بە قات و بۆینباخ و جانتای دیبلۆماسییەوە بەگەڵم دەکەوت بۆ مەکتەب، منیش کتێب و دەفتەرە شڕ و وڕەکانمم بە لاستیقی دەرپێ یان کۆنە چوپی تایەی پایسکیلی مەلا عوسمانی برام دەبەستەوە، ئەسعەد جانتاکەی لە دەرەوە بۆ هاتبوو و لە جانتا دیبلۆماسییە گرانبەهاکان بوو، ئەلهەقی ئەسعەد زۆری خۆشدەویستم، من لە ماتماتیک زیت و زرنگ بووم، ئاگرێک بووم نەبێتەوە، بە شێوەیەک مامۆستاکەشم سەرسامی دەستوپەنجەم بوو، پرسیارە قورسەکانیشم دەمودەست و زوو بە زوو و یەکرێ و بە خەتە خۆشەکەم بە دروستی شیکار دەکرد، ئەسعەد لە دەرسان زۆر دەبەنگ و وڕ و گێژ بوو، بەتایبەت لە ماتماتیک کە هەرەی لە برە دەرنەدەکرد، هاڕەی

لێوە دەهات و هیچی نەدەزانی، تەنانەت کۆ و کەم و دابەش و کەرەت و خشتەی کەرەتان هەر هیچ، بیرمە جارێکیان مامۆستا نادر لەسەر تەختە ڕەشەکە نووسیی ٤٢٤٢ و گوتی هەستە ئەسعەد ئەم ژمارەیەم بۆ وەخوێنە، ئەسعەد چەندی سەر دەهێنا و دەبرد، نەیدەزانی ژمارەکە وەخوێنێ، لە بنەوەش بە تیی چاوێ لە منی دەنۆڕی، بەڵکوو من بەهانایەوە بچم، منیش خۆم کڕ کردبوو و هەستوخوستم لەخۆم بڕیبوو، نادرە فەندیش تەنگاو بوو و خەریک بوو حەیزەرانەکەی لێ قیتکاتەوە، گوتی هاااا ئەسعەد؟ ناچ سێلاشمسەن؟ ئەسعەدم ئەسعەدە گوتی: مامۆستا چلودوو چلودوو. پۆلەکە تێکڕا لە تریقەی پێکەنینیاندا، ئەسعەد زۆر بەسەرەخۆیدا شکایەوە، بەو چلەی زستانە هەموو قالبی شەلاڵی ئاو و ئارەقە بوو و ڕەنگی لە ڕوودا نەمابوو. دەوام تەواو بوو و هەڵتەک هەڵتەک بەناو قوڕەلیتەی کۆلانی عارەباندا هاتینەوە، ئەسعەد لە ڕێ نە قسەیێ، نە گفتولفتێ، هیچ تاقەتی نەمابوو، ئەسعەد ئەم بەزمەی بە ملە من داهینا و لای بابی چوغڵی کردم. غانم ئەڵڵاوێردیی بابی ئەسعەد پیاوێکی شارستانیی فێس بەسەری ورگنی چاکەت و پانتووڕ لەبەری سەعاتی بە زنجیر لەبەریی گۆچان بە دەست بوو،

ئێوارەکەی هات و گوتمیی: کورم عەبە، کوری مەلای، زۆر ئاگات لە ئەسعەدۆکەم بێ، هەر ئەو کورەم هەیە، دەبێ وابکەی وەکوو خۆت یەکەم بێ، ناچار ڕۆژانە چەندی بۆخۆمم دەرس و دەور دەکردەوە، دەهەندەم بۆ ئەسعەد شەرح دەکرد، بۆیێ باکم بە خوێندن نەمابوو، کەچی دەتگوت من بۆ مقەببای شەرح دەکەم، لە گوێی ڕاستی دەچووە ژووری و لەوەی دیکەی بە بادا دەچوو، ئەسعەد نەک هەر ساقیت دەبوو، بەڵکوو ناویشی بوو بە ئەسعەد چلودوو چلودوو. ئێستا ئەسعەد شینە زەلامێکە لەخۆم کەتەتر و چەندین کۆمپانیا و مۆمپانیای لەبەر دەستە و یەکە لە دەوڵەمەندە نەقۆلاکانی نەک هەر هەولێر بەڵکوو کوردستانیش، ملی بەقەد تەنگەی مام دەروێشی خادیمی مزگەفتییە، لە حوکوومەتیش عارەب گۆتەنی کول فی کولە، کەچی جارجارە بەخۆ و بە پاسەوانەوە کە تووشم بە تووشی دێ، نەک هەر سەلاوم لێ ناکا، بەڵکە ڕووی خۆیم لێ وەردەگێڕێ، لۆۆۆ؟ نازانم! وادەزانی سەبەبی ساقیت بوون و تەواو نەکردنی خوێندنی لە نێوچەوانی من بووە، بەلام دڵنیام ئێستا ئەسعەدی تریلیۆنێر لە ناخی خۆی ئیرەیی بە من و ئەمسالی من دەبات، ڕاستە دەوڵەمەندە، تێرە، پۆشتەیە، شاپشاپانی

بە دەفتەرە دۆلاران دەکا، بەڵام ئێستا باشتر لەوە دەگا کە پارە زۆریی تا سنوورێک خۆشە، پاشتر زیادبوونی دەبێتە زیاد بوونی ژماران و ئەو لەزەتەی نامێنێ، دڵنیاشم ئێستا محاسیبەکەی سەرمایەکانی بە ژمارە بۆ بنووسێ، ئەو نازانێ بە دروستی بیخوێنێتەوە، ئەسعەد تریلیۆنێر لەکنە من هەر ئەسعەد چلودووەکەی جارانە. ئەم سەربردەیەم بۆ کاکە سمەی هاوڕێی دائیرەم گێڕایەوە، ئەو چ بلێ باشە؟

- ماخرا، بۆ مەمنوونی ئەو خوایەی نیی کە ئەسعەد هەر بە سەلام نەکردن وازی لێ هێناوی؟ هەر باشە کە دەتکاتێ، بەگرتنت نادا، یان وەک دەفتەرە دۆلارەکانی شاپشاپانێت پێ ناکا!

# ئیسف بخۆ، ئیسف مەخۆ

تەحسین دەرچووی ئامادەیی پیشەسازی بوو و کوڕی پیاوێکی خواپێداو بوو، کە ئامادەیی پیشەسازیی تەواو کرد، تازەکانە شەڕی قادسیە دەستی پێکردبوو، بابی بە پەسەندی زانی بۆ خوێندن بینێرێتە دەرەوە، تا لەو شەڕە شوومە بەدوور بێ، ئەوکات چوونە دەرەوە لە عیراق قەدەغە نەکرابوو، بابی سەفەرەکەی بۆ ڕێکخست و چەند مانگ دواتر تەحسین خۆی لە بوخارست بینییەوە و لەوێ بە قسەی باوکی کرد و داواکاریی خوێندنی پێشکەشی کۆلێجی پزیشکیی بوخارست کرد و لەوێ وەرگیرا. تەحسین کەوتە کەشوسرووتێکی تازەوە کە زۆری بەلاوە نامۆ بوو، خوێندنی پزیشکیی بوخارست لە هەموو خوێندنێکی وڵاتان سووک و ساناتر بوو، دوای شەش ساڵان خوێندن، تەحسینی دەرچووی پیشەسازیی بەشی مەعادن، کە بە هەزار حاڵ ئەوێی پێ تەواو کرا، هەر بە فشە بووە دختۆر

تەحسین بە پسپۆڕیی تەندروستیی گشتی، چەند ساڵ دواتر تەحسین گەڕایەوە عیراق و ئێستا تەحسینی مەعادن دختۆرێکی بەناوودەنگی شارەکەمانە، هەنووکەشی لەگەڵدابێ، دختۆر تەحسین لە هیچ تەبیعاتێکی هەشتاکان داینەکەلاندووە، پانتۆڕی شارلستۆنی دەلینگ چل سانتیمەتریی کەمتر لە پێی هاڵناکێشێ، هەروەها سەعاتەکەی دەستیشی هەر ئۆریانتە سێ قورمیشەکەی جارانە، عەینەکی برۆداپۆشەریش نەبێ، لە چاوی ناکات، لەبەرئەوەی قوتەبنەشە، قەت بەبێ قۆندەرەی کەعبولعالیی بە ئاوەزێنە نایەتە دەرەوە کە شارلستۆنەکەی دایدەپۆشێ، سمێڵیشی شێوە قەیتانییە کە ئەوکات بە لاسایی پاڵەوانانی فیلمە هیندییەکانی چەشنی(شامیکابوور) لەناو جاحێلان ببووە مۆدێل. قەسەم بەخوا دختۆر تەحسین ئێستاشی لەگەڵدا بێ، باوەڕ ناکەم بتوانێ سپێڵی پاراسیتۆل بە پوختەیی بنووسێ، لە ڕاچێتەی نەخۆشان پیتەکی ئاڕ بە کەپیتەڵ دەکات و دوای پیتەکەش دەیکاتە شقلیپقلی و شەڕەپشیلە و سەیدەلییەکانیش تێیدەگەن، لە یەک دوو حەبی وەک پاراسیتۆل و ئەمپیسیلین و تیتراسایکلین و شرووبی کیبرۆن و ئەنترۆستۆپ و ئەسپرین بترازێ ناوی هیچ حەب و دەرمانێکی

تر نازانێ.

بەردەستێکی تەحسین لە نەخۆشخانەی کۆماری هەبوو ناوی یووسف بوو، کە دختۆر تەحسین بە ئیسف بانگی دەکرد، ئیسف کەپووی تووشی دەردێک ببوو، هیچ دختۆرێکی هەولێر سەریان لێ دەرنەدەچوو، خزم و ناسیار ئامۆژگاریی ئیسفیان کرد بۆ چارەسەری بچێتە بەغدا، ئەوەبوو ئیسف ڕووی لە بەغدا کرد و لەوێ دختۆرێکی پسپۆر پێی گوتبوو: (کەپووت تووشی شێرپەنجە بووە)، بۆیە حەبێکی بۆ دانابوو کە بەردەوام بیخوا. ئیسف هاتەوە هەولێر و لەسەر حەب خواردنێ بەردەوام بوو و ماوەیەک پێ چوو هاتەوە دەوام. ڕۆژانە دختۆر تەحسینی مەعادن بانگی ئیسفی دەکرد و ئامۆژگاریی دەکرد کە بایەخ بە خواردنی حەبەکانی بدات، گوایە ئەویش شارەزایە و لە بواری پزیشکی زۆر تێدەگا. گفتوگۆ ڕۆژانەکانیان بەبەر چاوی کارمەند و خزمەتگوزاران ئاوا دەستی پێ دەکرد:

- ئیسف، کوڕێ من حەبەکەت بخۆ هاااا، ئەمن پێت دەڵێم حەبەکەت بە مەزبووتی بخۆ، کوڕم بیخۆ لەبیرنەکەی هاااا دوایە دەمریی.
- ئاخر دختۆر کە حەبەکە دەخۆم کەپووم ئەستوور دەبێ کەپوو.

- ئـێ مـادام کەپووت ئەسـتوور دەبـی، مەیخـۆ تـەواو.. لێگـەڕێ مەیخـۆ، وازی لـێ بینـە، فڕێیـدە و مەیخـۆ.

- دختـۆر ئاخـر دەردەکەپووەکـەم شـێرپەنجەیە، نەیخـۆم ترسـێکەم بمکـوژی.

- ئـێ ئیسـف مـادام وایـە بخـۆ، ئـا ئـا بیخـۆ بیخـۆ، حەبەکـەت بخـۆ لەبیـر نەکـەی هـاااااا، ڕۆژانـە بیخـۆ.

# خۆشەحەبی ئاغای

ئاغای چۆمەبزمارە لە شەستەکانی سەدەی تێپەڕیی، هەفتانە کە دەهاتە شار، فێر بووبوو سەردانی ئەحمەد تەبیبی بکات و لەوێ خۆشەحەبان وەرگرێ کە قالبی پێی ئیسراحەتانی دەکرد، وەختێ دەیخواردن دەهاتەوە تەمەنی هەواداریی بەباهاتنێ و کلوکۆ و زرمەزڕتەیی پێ دادەمرکایەوە، هەفتەی بووریی پێی نەکرا بێتە شاری، بۆیە کە زانیی حەمەدەمین پەقرەج دەچێتە شاری، لە دووی هەنارد و ڕایسپاردێ کە لە گەڕانەوەی بەکن گڵکەندیدا بێتەوە و سەرێکی ماڵی خاڵەحمەد تەبیبی بدات و پێی بڵێ ئاغام ڕایسپاردووم حەبانم لای جەنابت بۆ بێنێ، حەبی پشت ئێشانێ، ئەحمەد تەبیبی دونیا دیتە تێیگەیشت و حەفت حەبە کۆلاجی بایی یەک حەفتەی لە خۆشە حەبان لەناو پرێسکۆکەیەک پێچا و لە مستی حەمەدەمینی کرد و پێی گوت دەستکاریی نەکات و ئەمانەتەکە بە دروستی

بگەیەنێ.

حەمەدەمین بە خۆی و ماکەری زڕتەبۆزەی بەڕێ کەوت و لە گردومرد و زوورگەکانی کووران و قەتەوی ئاوا بوو، تاریکیی بەسەرداهات و هەستی بە پشتێشەیەکی توند کرد و هەموو قۆڵنجی بە ژان کەوتن، بیری کردەوە واچاکە حەبەکی لەو ئەمانەتەی کە بۆ ئاغای خۆی هێناوە قووتبدا، بەڵکوو لەوان ژانان قورتار بێت، ماکەری لە گاشەبەردێکی گەورەی خوار زوورگەکان بەستەوە و بە ترسەوە حەبی لە قوڕگی ئاودیو کرد، دوای دەمێک حەمەدەمین پەقرەج هەستی کرد هەوای نەفس و قیتکەی نێو لینگانی خۆش دەبێ و گوڕاجی تازەی لەناو هەناواندا دەگەڕێ، پشتێشەی هەر لەبیر نەما و پشتێنەی لەخۆی کردەوە و بای فێنکی نیسانێی لە بنگەڵ و ناوگەڵی دەدا و خۆی خێواندە ماکەرێ و دەعەمەلی هێنا و، دوای بەتاڵکردنی کەفوکوڵی دەلینگان سەری بە تاشە بەردێ کرد، خەوێکی خۆش بردییەوە. کە بە ئاگاهات نیوە شەو تێپەڕیبوو، ترسی ڕێی لێ نیشت و بیری هەر لەوە دەکردەوە دەبێ بە سەلامەتی بگاتەوە ئاوایی؟ بەو خەم و نیگەرانییانەوە بەڕێ کەوت و کە گەییەوە چۆمە بزمارەی، ئۆخەیەکی پڕ لە زەردەخەنەی هاتێ و نەیزانی ئاغا لە سەر گردێ

چاوەڕێیەتی، حەمەدەمین کە چاوی بە ئاغای کەوت، خەنی بوو و دەستی لە باغەڵی ڕاکرد و خۆشەحەبانی لە مست ئاغای نا، ئاغاش حەبی ژماردن بینیی شەش حەبن، ئەو هەموو جاران حەفت قلە حەبی بایی یەک هەفتە لە ئەحمەد تەبیبی دەستاند و خاڵەحمەد خۆی هەموو جار حەفت دانەی بۆ دەگرتەوە و بەڕێی دەکرد.

ئاغا ڕووی کردە حەمەدەمین و لێی پرسی: ئەوە بۆ شەش قلن؟

حەمەدەمین کوا قلەکەی دی؟

حەمەدەمین گوتی: ئاغام سەلامەت بی، لە ڕێیێ لەناو زوورگان تووشی ژانە پشتێکی قورس هاتم و دانەیەکم نەخواردبا نەدەگەییمەوە گوندی و هەر لەوێ دەمردم.

ئاغا کەیفی هات و گوتی مادام ژانەکەت وا توند بووە دووانت لێ خواردبان حەمەدەمین.

حەمەدەمین پێکەنی و گوتی ئاغا ئەوە یەک قلم لێی خوارد وای لێ کردم و هەموو هەناوی بە کوتەکوت یەخستم و ئاسمانی لێ کردمە ڕەنگاوڕەنگ و ئاڵاندمیە ماکەرێ، چما دووانم خواردبا، کێ دەڵێ ئێستاکانێ نەدەهاتمە گژە تۆش؟

## پەروەردە دەمانهاڕێ

مامۆستا سدیق قۆپەقرانیی پسپۆری ماتماتیک لە یەکێک لە ئامادەییەکانی گەڕەکی بەفریقەندیی کۆیە، نزیکەی سی ساڵ دەبوو مامۆستا بوو، لەمێژ بوو کەلکەلەی خۆ گوازتنەوەی بۆ یەک لە ئامادەییەکانی نزیک ماڵی خۆیان لە گەڕەکی ئیسکان، لە مێشکیدا دەیهێنا و دەیبرد، چونکە بەفریقەندی لە ماڵەوان دوور بوو، سدیقەفەنی بەو زستان و بێ مووچەییە ناتوانێ ڕۆژانە ئەم ڕێیە دوورە بکوتێتەوە، بۆیە بەپێی سیستمی نوێی پەروەردە، داواکارییەکی لە قاقەزێکی ئەیفۆر لوولدا و دایە بەڕێوەبەری قوتابخانەکەی و ئەویش بەپێی سیستمی نوێی پەروەردە، داواکەی هەنارد بۆ بەڕێوەبەری پەروەردە و ئەویش هەر بەپێی هەمان سیستم نووسراوەکەی ئاراستەی یەکەی سەرپەرشتیاری ئامادەیی کرد و لەوێشەوە هەر بەو سیستمە تازەیە نێردرا بۆ سەرپەرشتیاری پسپۆریی ماتماتیک تا بزانن ئەو ڕای چۆنە!
دەکرێ سدیقەفەنی بگوازرێتەوە؟ یان نا!

مامۆستا سدیق لەوێ پرسیی جا خۆ سەرپەرشتیارەکەم دەوام و فەرمانگەکەی لە هەولێرە، چۆنی بگەمە لای؟

لە پەروەردە پێیان گوت ئەمە سیستمی نوێی پەروەردەیە و کەس ناتوانێ بە موو لێی لادا و هەر دەبێ بچیە هەولێر و لەوێ لە یەکەی سەرپەرشتیاری ئامادەیی کە دەکەوێتە پشت تەوارییەکە، سەرپەرشتیارەکەت ببینییەوە و ئەو ئیمزای ڕەزامەندیی لەسەر داواکەت بکا، جا بیهێنییەوە بۆ ئێرە، ئەمە سیستمی نوێیە و هەر دەبێ وابکەی.

سدیقەفەنی زۆری داوا کرد بەڵکوو ئیشەکەی بەبێ سەفەری هەولێر بۆ بکەن و وتی جاران ئەم جۆرە داواکارییانە، ئەم هەموو زەحمەتی و سەفەرەی نەدەویست، ئەمە بۆ واتان بە زەحمەت یەخستووە؟ وەڵامیان دایەوە مامۆستا ئەمە سیستمی نوێی پەروەردەیە، هەر دەبێ بچیە هەولێر، جا خۆشت مەهێنە و مەبە.

مامۆستا سدیق، بە نەدانی ڕۆژانەی ئەو ڕۆژەی سێ منداڵە سەرکەوبنکەکەی و چەند هەزار دینارێکی تر بە سەت ئەملا و ئەولا توانیی کرێی تاکسیی هەردوو سەری سەفەری هەولێر پەیدا بکات. ڕۆژی دواتر سدیقە فەنی بەو سەقەم و

سایەقەیە، بەیانیی زوو لەگەڵ شیرەی نێرەکەرێ لە ماڵ هاتە دەرەوە بەرەو هەولێر بۆ یەکەی سەرپەرشتیاری. لە گەراج سواری تاکسیی هەولێر بوو. تاکسی بەڕێ کەوت و پاش نیو سەعاتان، لەکن دەربەندی گۆمەسپان، قەمەرەکەیان بەهۆی تیژاژۆیییەوە وەرگەڕا و سدیقەفەنی و دوو لە سەرنشینانی بوونە قوربانیی حازرییان و ڕۆژی دواتر تەرمی پیرۆزی سدیقەفەنییان لە ئاڵای کوردستان پێچاو لە ڕێوڕەسمێکی پەروەردەییانەی پڕ لە سیستم هێنایان لە هەمان گۆڕستانەکەی مامۆستای نەمر کەریم شارەزای لێیە، بە گریان و فیغانی مامۆستا و قوتابی و بەڕێوەبەر و کارمەندانی پەروەردەی کۆیەوە، جەنابی سدیقەفەندییان بە تەلقینی مەلا فارووق شوانییەوە، جوان و پوختە ناشت. قوتابییانی بەفریقەندی ئەو ساڵە بێ مامۆستا مانەوە، چونکە دامەزراندنی مامۆستایان وەستابوو و سیستمە نوێیەکەش نەیتوانی مامۆستایەکی دیکەی ماتماتیکیان بۆ بدۆزێتەوە.

کۆیی گوتەنی: جا قوربان سیستمی نوێی پەروەردە قوربانیی زلی دەوێ.

# پرێمزچی!

شـەڕە چەقۆیەکـی عەنتیکـەم لـە ناوەنـدی بـازاڕ بینـی، لـە خـوار چایەخانـەی مەچکـۆ دوو سـێ کـەس هەنگڕابوونـە گەنجێـک بـە چەقـووان شـلوکوتیان کـرد، ئـەو خەڵکـە هەمـووی هاتبوونـە دیـاریٚ و پۆلیسـیش خۆیـان لـێ لـە گێلـی دابـوو و بووبـوون بـە کـەڕەی شـەربەت و وەک ئـەوەی ئاگایـان لـە حەشـتەبای خـوای نەبـێ، ئیدی خۆیـان تێهەڵنەدەقورتانـد، دواتـر گەنجەکـە خـۆی لـە هێرشـبەران ڕاپسـکاند و هاتـە لاوە و بینیـم هەمـوو قالبی لـە خوێن وەرهاتبوو، هێرشـبەران وەک پەلیک بۆی دەرچـوون. خەڵکێکـی هاوسـۆز لـە بریندارەکـە خڕبوونـەوە و خەریـک بـوو لـە حاڵوئەحواڵیـان دەپرسـییەوە و پیرەمێردێـک لەولاتـر دیاربـوو لێـی پرسـی:

کوڕێ من، ئەتوو چ کارەی؟

گەنجـە وەرامـی دایـەوە: مـن ئیشـی پرێمـزی دەکـەم. یەکێکـی تـر هاتـە قسـە: چمـا ئێسـتا کـەس

پرێمـز بـەکار دێنـی؟ بـۆ پرێمـز مـاوە؟ پرێمـزی چیی؟ دیاربوو یـەک دووەک لـە هاوسـۆزانی گەنجە زامدارەکـە شـارەزای ئـەم حاڵـە بـوون و یەکێکیـان هێـروە هـات و باسـی ئیشـی پرێمـزی بـۆ کردیـن:

خـۆ ئیشـی پرێمـز پێوەندیـی بـە پرێمـزەوە نییـە. چمـا ئەنگـۆ نازانـن ئیشـی پرێمزی چییـە؟

منیش وەک هەمیشـە دوور لە خۆتێهەڵقورتاندن، تەنیـا گوێـم گرتبـوو، کابـرا هاتـەوە قسـە و باسـی ئیشـی پرێمـزی کـرد: ئیشـی پرێمـزی ئەوەیـە کـە چەنـد چەرچییـەک ڕێـک دەکـەون شـت بـە مزایـەدە لـە دەوروبـەری قـەڵا بفرۆشـن و یەکێکیـان چەنـد مۆبایلێکـی خرابابـەت دێنـێ و دەیکاتـە هاتوهـاوار و مزایـەدە هەتـا خەڵکـی لـێ دەورووکێـن، لەولاتـر هاوڕێکانـی دێـن کـە پێشـتر لەگەڵـی ڕێککەوتـوون، دواتـر بەشـە قازانجـی خۆیـان هەڵدەگرنـەوە، ئـەوان دێنـە نـاو خەڵکەکـەی دەوروبـەری مزایەدەکـەر و لەسـەری زیـاد دەکـەن، یەکـی دیکـە و ئەوانـی تـر، هـوردە هـوردە مزایەدەکـە بـەرز دەکەنـەوە تـا قوڕبەسـەرێکی غەشـیم پێـوە دەبـێ و دەیکڕێـت. بەو هاوڕێیانـەی مزایەدەکـە بـەرز دەکەنـەوە دەڵێـن پرێمزچـی و ئیشـی پرێمـز ئەوەیـە!

لـە هەولێـرێ تـا سـەر بمێنـێ قـوون عاجباتییـان دەبینـێ.

## تاهیر تەنتریۆ

تاهیر تەنتریۆی برادەری منداڵیم، دراوسێشمان بوو دەرگا بە دەرگا، ناوی تەنتریۆ لەوەوە هاتبوو کە ڕۆژێکیان لە تۆپانێ چووبووەوەماڵەوە و زۆری تینوو بووە و بە هەڵە شووشەی تەنتریۆی بەسەر دەمیەوە کردبوو، بۆیە چوار پێنج ڕۆژان لە نەخۆشخانە بێ زمان کەوتبوو و دایە و بابەی تەمایان لێ بڕیبوو، بەڵام بە قەولی باوکی گوتەنی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو چێتربوون چوو بوو و ماوەیەکی پێچوو، هاتەوە ناومان، دواتر بووە باشترین یاریزانی تۆپی پێی هەڵبژاردەی هەولێر، تاهیر ڕقی دونیای لە خوێندن بوو، لە وانەی ئینگلیزی هڕەی لە بڕە دەرنەدەکرد، هەمووجار پێی دەگوتم: ئەمن نە داکم ئینگلیزە نە بابم، نازانم ئەو ئینگلیزییە چییە بە پاشەڵمانەوە نووساوە! تاهیر لە پێنجی سەرەتایی، وەک خۆی گوتەنی مەکتەبی دایە بەر لووشکان و نەهاتەوە بەر خوێندن، کە گەورە و هەراشیش بوو، حەسرەتی بۆ ئەوە هەڵدەکێشا کە

چۆن وەک ئێمە خوێندنی تەواو نەکردووە، تاهیر سالانێک بزر بوو و دەیانگوت بووەتە (پێ میم)، بەڵام نەماندەزانی بووەتە پێ میمی کامە حیزب! دوای ڕاپەڕینی حەشامەتی کوردستان لە دژی دامودەزگاکانی بەعس، تاهیر بواری بۆ ڕەخسێنرا لە قوتابخانەیەکی ئێواران بە هەزار شەڕە شەق و غەلوغەش، بڕوانامەی ناوەندی وەربگرێ. تاهیرە فەندیم ئێستا کە بە ئینگلیزی دەدوێ دەڵێی حەیرانان دەخوێنێتەوە، شێوە گۆکردن و ئاخاوتنی پڕە لە ئحم ئحم، لە قسەکردنی ئینگلیزی نەتری یەکجار زۆرە، دەڵێی دۆجەکەی مام ڕەمەزانە، کورە هەر دەڵێی گایە و دەبۆڕی! هەر کە گوێت لێی دەبی وادەزانی تازە لە پەستی نۆغەرانێ گەیشتووەتە هەولێر، ئینگلیزییەکەی نۆغەرانانەیە و سەربەقوڕ دێنێتە حیتوهۆڕ، تاهیر بە غەلوغەشەوە هات و هێنای تا لە زمانی ئینگلیزی بووە خاوەن بڕوانامەیەکی بەرزیش. قەسەم بەخوا باوەڕ ناکەم شتاقە هاووڵاتیی ئینگلیز وشەیەکی لێ تێبگات.

جارێکیان ڕۆژنامەنووسێکی ئینگلیز وەک بەرپرسێکی ئەکادیمی داوای لە تاهیر تەنتریۆ کردبوو وتوێژی لەگەڵدا بکات، بەڵام کابرای ئینگلیز لە ئینگلیزییە حەیراناساکەی تاهیر نەگەیشتبوو و بۆ لێک حاڵیبوون، داوای وەرگێڕێکی

کردبوو. جاران من بە حەسرەت بووم تاهیر بۆ یەک جار عەین و حێ جێگۆڕ نەکات، کەچی ئێستا شێوەزاری خۆی بەلاوە ناوە و بە شێوەی ناوچەیەکی تر قسان دەکات و لێیشی ناوەشێتەوە، سەریشی بە بۆیەی مارکە ڕۆتانا بە باقوبریق دەخا و ڕەنگی ڕەشی قژ و ئەبرۆ و برژانگی هەر دەڵێی لە کونیلە ڕەشەکانی فەلەکەوە بۆی هاتووە، هەروابێتەوە، ئەنگوستیلەیەکی زێڕی نقێم پیرۆزەییشی خستووەتە پەنجەی، لە خەڵک فێرە ساونا و غاردانی پارکیش بووە. لەم ڕۆژگارەی ئێستاماندا پیاوم دەوێ لە قوتابییانی بەشی ئینگلیزی بێ ئیمزای تاهیر تەنتریۆ بڕوانامەی بدرێتێ. ئەم هەرێمۆکەی خۆمان پڕە لە تاهیر تەنتریۆ، حکوومەتن کارگەیەکی بە بڕشتی بەرهەم هێنانی تاهیر تەنتریۆکانە، جا چتۆ تاهیر؟ هیی تڕوتۆپەستوور و کەللەپووت.

# عیشقێکی ناگەهان

تەحسین تەپشوو جاحێڵێکی کەڵەگەتی کۆلانی عارەبان بوو، تازەکانە سمێڵی گووگرە بوو بوو، ڕۆژانە دانی ئێواران قەیاسی ڕۆنی لە قژی دەدا و لووس و پووس دایدەهێنا و عەینەگێکی برۆ داپۆشەری لە چاو دەکرد و دەهاتە سەری کۆلانێ ڕەپ ڕادەوەستا. لەوێ چاوەڕێی کچی موختاری دەکرد کە لە قوتابخانە دەهاتەوە، کچە جوانەکەی موختاریش ئاگای لە حەشتەبای خوای نەبوو، وەک عارەب دەڵێن (حب من طرف واحد) بوو. ئەم عیشقە ناگەهانە تەحسین تەپشووی داڕزاندبوو، بیست و چوار سەعاتی خوا خەریکی داڵغە لێدانێ بوو. سەمیر هەمەوەندیی شاعیری گەڕەک ئەم شیعرەی لەسەر دانابوو کە هەمووجار ئێمەی هەرزەکار بە میلۆدی و بە کۆرس دەمانگوتەوە بێ ئەوەی ماناکەی بزانین:

دەترسم بمرم
سەر بنێمەوە،
وەک ئەحمەد ڕامی
بۆ عیشقی کەلسووم
چونکە عیشقی تۆ
هوردی کردووە
جەستە و پەراسووم
خۆ گەر تۆ بۆ من
نەیەیتە ڕایێ
شەرت بێ هەر ئەمڕۆ
قوڕی دنیایێ
لە جەستەم هەڵسووم.

# تۆفیق پەتپەتۆک

جاران لە مەکتەب پێمان دەگوت تۆفیق شێلم، چونکە یەکجار زۆری حەز لە شێلم بوو، بە تایبەت ئاوەکەی، کە بە فنجان فڕی دەکرد دەتگوت ئاوی حەیاتێی لە قالبی دەکەن، ساڵانی دواتری تەمەنی، کوردپەروەرێکی ئەوەندە ڕقەستووری لێ دەرچوو، خەڵک ناویان لێنا تۆفیق پەتپەتۆک، وشەی پەتپەتۆک لە وشەی (پەتی) وەرگیرابوو، چونکە بە کوردییەکی یەکجار پەتی لەگەڵمان دەدوا، هەر هەموو شتەکی دەکردە کوردی، بە حیزبی بەعسی دەگوت (پارتی ژیانەوەی عارەبی هەرەوەزی)، کوردپەروەرییەکەی لە تامی بردبووە دەرەوە و هەرکەس وشەیەکی بێگانانی بەکار هێنابا، ئەو ڕقی لێ هەڵدەستا و جنێو و قسەی سووکی دەسرەواندێ، ئێ خۆ لە خەبات و تێکۆشانیش کەمی نەکرد، ئەو ساڵانی تافی لاویی بە پێشمەرگایەتیی بەڕێکرد، کەچی ئێستا لە برسان قۆڕەی سکی دێ و وەک خۆی دەڵێ:

قەتم تێر بە سکی خۆم نەخواردوە و بەبیریشم نایە گیرفانم پڕ پارە بووبێ. ئێستا تۆفیقم تۆفیقە! لە کوردایەتیی باداوەتەوە و کە بەسەرهاتەکانی خۆی دێتەوە یاد، شەرمێ لە خۆی دەکاتەوە. هەمووجار دەیگەمێ و پێی دەڵێم:

باشە تەوفیق پەتپەتۆک ئەتوو جاران دەتکوشت و نەتدەشاردەوە، ئەوەندە لەسەر کوردایەتیی ڕژد بووی، ئەوە چۆنە وازت لەو حاڵە هێناوە؟

وەمدەڵێتەوە: کاکە گیان ئەویش مەرحەلەیەک بوو.

من بۆی دەکەمەوە کوردی، قوربان بڵێ قۆناغێک بوو.

دەست دەکاتەوە بە پێکەنینە پڕ لە حیتوهۆڕەکەی و دەڵێ:

مەرحەلەی کەرایەتیی قوربان!

## حەمەدەی باب و هەشت داروچکە

مەبەست لە یەکگرتوویی، سەرکەوتن و هێز پەیدا کردنە، بۆ ئەمەش گەلێک پەند و چیرۆک لە کوردەواریدا هەن، با ئەمەی خوارەوەتان کە بە شێوازی خۆم، بە لێزیادکردنەوە بۆ بنووسمەوە:

حاجی حەمەدەمین کە خاوەن هەشت کوڕ بوو، پیاوێکی دونیا دیتە و پڕ ئەزموونی ژیان بوو و خەڵکی ئاوایی حسێبی تایبەتیان بۆ دەکرد و بۆ زۆر کار و مەبەست، پرسوڕایان پێ دەکرد و بۆ سوڵحکارییش سەرمەجلیس و قسەزان بوو و بە دەگمەن وا ڕێکدەکەوت خەڵک لە قسەی دەرچن، حەمەدەمین لە هەشتا ئاودیو ببوو. ڕۆژێک بیری کردەوە کوڕەکانی کۆبکاتەوە تا ئامۆژگارییان بکات بۆ ئەوەی لە دوای خۆی گوزەرانیان بێ کێشە و گرفت بڕوات و پەند لە قسە و لفتی سەنگین و ئامۆژگارییەکانی وەربگرن. بانگی سابیری کوڕە گەورەی کرد کە بچێ لەو ئاقارە هەشت داروچکەی سفت بێنێ، پاشان

سەرجەم براکانی لە دیوەخان کۆبکاتەوە. دوای سەعاتێک سابیر و هەر حەوت برای لە دیوەخان حازر بوون و بابیان لە سەری مەجلیس دانیشت و لەبارەی ژیان و گرنگیی تەبایی هەر هەشتیان زۆری قسە بۆ کردن، حەمەدەمین مەبەستی ئەوە بوو کە دوای مردنی، ئەوان لەژێر فەرمان و ئەمری سابیری برایاندا بن و لەگەڵ یەکتردا بە شێوەیەک گونجاو و کۆک بن کە خەڵکی ئاوایی ئیرەییان پێ ببات. پاش قسە و باس و وتوێژێکی فرە، حەمەدەمین داوای لە سابیر کرد داروچکە سفتەکانی بداتێ، سابیر یەکەوڕاست قیت بووەوە و هەشت داروچکەکەی لە بەردەم بابی دانا، هەر داروچکەی بستێک درێژ دەبوو. پاشان حەمەدەمین دەستیکرد بە ئەزموونندان بۆ کردارێنی باسەکەی لەبارەی تەباییەوە، داروچکەی دایە هەمووان و داوای لێ کردن داروچکەکان بشکێنن، هەر هەشتیان داواکەی بابیان بەجێ هێنا و حەمەدەمین ڕووی تێکردن و گوتی: کوڕەکانم، ئافەرینتان لێ بێ کە توانیتان ئەم داروچکانە بشکێنن، گەر بەتەنیا بن ئەوا وەک ئەم داروچکەیە سووک و سانا دەشکێن، بەڵام پێکەوەیی و یەکگرتووییتان هێزی زۆرتان دەداتێ. ئەمجارەیان حەمەدەمین هەر هەشت

داروچکەی کە بووبوون بە شازدە داروچکە بە دەستەوە گرت و دایە سابیری کوڕە گەورەیان تا بەیەکەوە بیانشکێنی، حەمەدەمین لە چاوەنۆڕی ئەوەدا بوو کە هەر شازدە داروچکە بەهۆی هێز و سفتیی زۆریانەوە، نەشکێن و لە مێشکی خۆیدا دەرسی ئەوەیان پێ دەدات کە چۆن ئەم داروچکە یەکگرتووانە بە یەکەوە هێز و توانایەک پەیدا دەکەن کە مەحاڵە بە تاکە کەسێک بشکێن، بیری لەوەش دەکردەوە کە یەکگرتوویی ئێوەش کوڕەکانم، تەبا و تفاقیتان بۆ هەموو کات و سەردەمێک دەبێتە هۆی سەرکەوتنتان، بەڵام ئەو چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد سابیر وانە و ئەزموونەکە بە خەسار دەدات و وا دەکات قسەکەی ئەو نەچێتە سەر، فەرمانی دایە سابیر: ئادەی سابیر، بزانم دەتوانیی ئەمانە بەیەکەوە بشکێنی؟ سابیرم سابیرە، کە کەتە زەلامێکی نەقۆڵای چوارشانە بوو، بە بازووی توندوتۆڵەوە قرچەی لە داروچکەکانەوە هێنا و یەکەوڕاست هەر شازدەی بەیەکەوە لە ناوەڕاستەوە کردن بە دوو کەرت، داروچکە بوون بە سی و دوو. حەمەدەمین دەمی بوو بە تەڵەی تەقیوو و دەمێک ماتو مەلوول مایەوە. ئارەقەی هەنیەی ڕێچکەیان بەست و تک تک کەوتنە خوارەوە.

دواتر حەوت کوڕەکەی تر ڕوویان کردە بابیان و پرسییان: باوە، بۆ وا پەشۆکاوی و مەبەستت لەم داروچکە شکاندنانە چیی بوو؟ ئێمە تێنەگەیشتین!

حەمەدەمین بۆ یەکەمجار بوو لە ژیانیدا بەم شێوەیە نشوستت بێنێ و وەرامی دانەوە:

مەبەست هیچ نەبوو کوڕەکانم، ئەوەی دەمویست، سابیر گووی تێکرد.

حەمەدەی باب دەست لە گونان درێژتر مایەوە! و براکانیش پایدۆزیان لێ کرد و هەر یەکەیان بە لایەکدا ڕۆیشت!

# خدر خڕنووک

خدر خڕنووک تەمەنی گەیبوەتە هەشتا، لە تافی لاوییەوە زۆری مەراق خڕنووک بوو و دەموسەعات بەرکی پڕ خڕنووک بوو، کە گەنج بوو زۆری حەز دەکرد تەبای مندالانی نۆغەران بخرێتە بەر خوێندن و خوێندەواری پەیدا بکات، کەچی بابی لێنەدەگەڕا بخوێنێ، هەمووجار پێی دەگوت خدرە سەرکەستوور، دەزانم زۆرت مەراق خوێندنی شەیتانییە و گەلێکت حەز لێیە ببیە مەکتەبلی، بەلام بەو خوایەی عەرز و ئاسمانی داناوە، قەسەم بە ڕەببولعالەمین، لێناگەڕێم پێچکەت بە مەکتەب بکەوی، کوڕێ من ئەتوو هەتا جۆت و جەنجەڕ و دروونە و جۆخین و تەبارە مابن، عەیبێکی گەورەیە بابت بەجێ بێلی و توخنی کاری زەندیقان بکەوی. ئەوجا خدر ئەو لۆکەیەی لە گوێی خۆت دەربێنە.. خدر نەمرد و لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا خۆی لە مەحولئومییەی ناونووس کرد و لەو قایدەی

خۆی فێره خوێندەواری کرد. ئێستا خدرم خدره! بەو تەمەنەی، بیست و چوار سەعاتی خوای لەسەر فەیسبوکە. هەر بەوەندەش نەوەستاوە، بەڵکوو بیرەوەریی خۆیشی نووسیوەتەوە کە پڕە لە باسوخواسی منداڵی و ناوی لێناوە (لە خڕنووکەوە بۆ فەیسبوک.)

پێموایە بیرەوەرییەکانی خدر خڕنووک پڕە لە پاکی و زۆریش پیرۆزتر و ڕاستگۆترە لە بیرەوەریی زۆر لە سیاسییە درۆزنەکان.

# لەتیفە لووتەی بەرماوەخۆر

لەتیفە لووتە بەردەوام دژی پێشمەرگە قسەی دەکرد و ئەوکاتەی شۆڕشی کورد تووشی نسکۆ بوو، ئەو کۆڵێ خۆشحاڵ بوو، ئەو پێشمەرگەی بە چەتە و شەقاوە و حیزودز لە قەڵەم دەدا، گوایە خۆی پیاوێکی مارکسییە و لەمەلاو لەولادا خۆی وا دەناساند گوایە کۆمۆنیستە، کەچی هیچی لە مارکسییەت و کۆمۆنیست نەدەزانی. لەتیف ساڵانێ لەوەبەر لە کۆڵانەکانی سەیداوە مریشکێک دەدزێ و هەر ئەو ڕۆژە لێی ئاشکرا دەبێ، بەهۆیەوە کەوتە زیندان و پازدە بیست ڕۆژێکیان لە بەندیخانەی سەرای پەستا، دواتر لەتیفە لووتە کە لە زیندانێ هاتە دەر، چووە ڕیزی حیزبێکی کارتۆنیی کوردان کە بەعس دژی تێکۆشەرە ڕاستەقینەکانی کورد یەک دوو حیزبۆکەی بووکەڵە و بەرماوەخۆری دروست کردبوو و لەتیف لەوێ وەک تێکۆشەرێکی! مەکتەب سیاسی مووچەیەکی مانگانەی قەبەی

مفت دەخستە باخەڵ و شەوانەش بە خۆ و دەمانچەی پشتیەوە، لەگەڵ یەک دوو دەمڕووت و جاشی وەک خۆی لە یانەکان چاکترین جۆری ویسکیی نۆش دەکرد و لە جگەرەی ڕۆسمانیش بترازێ بە لالێویەوە نەدەکرد، جگە لەوەش بەعس لە بۆنەکانی وەک ١٧-٣٠ی تەمموز دەمانچە و پاداشتی بەهاداری دەدانێ، ئەوانیش بۆ بەعس وەفادار بوون و مانگانە ڕاپۆرتی خۆیان لەبارەی کوردپەروەرانەوە دەدایە دائیرەی ئەمن. لەتە لووتە دوو ساڵ دواتر بووە خاوەن خۆشترین خانوو و تازەترین مۆدێلی قەمەرەش، ئێستا لەتیفۆک جگە لەوەی مووچەی زیندانییانی سیاسیش وەردەگرێ گوایە لە ڕیزەکانی حیزبی کۆمۆنیست تێکۆشاوە، کە سەری مەجلیسان دەگرێ، خۆی بە ئەکبەر کوردپەروەریش دادەنێ و بەردەوامیش باسی تێکۆشان و کوردایەتیی خۆی دەکات لە سجنی سەرای، لە دائیرە و وەزارەتانیش قسەی دەخوا و بەرپرسەکانیش زەندەقیان لێی ڕژاوە و حسێبی تایبەتی بۆ دەکەن.

لێخوڕە لەتە لووتە، شۆڕشە!

# ئەولادی عەسر

شێعەلی خوێندەواریی نەبوو، لەگەڵ ئەوەش پیاوێکی ترۆتۆپەستوور بوو و خۆی بە گوویکی گەورە دەزانی، بەڵام گرێی نەخوێندەواری، ناوەوەی هەنجن بە هەنجن کردبوو. زێنەدینی کوڕە گەورەی شێعەلی هەرزەکارێکی دەمچەفت بوو و بە کەلەش لەندەهۆرێک بوو، زەلام لێی دەترسا، شێعەلی ئەوەندەی دار لە دەمی زێنەدین وەردابوو، زێنەدین بە تەواوی شەرمی لە بابی شکابوو و جاری وا هەبوو لەسەر شتی بێمانا دەبووە مشتومڕیان و بابی لەبەر سەی ڕوودەکرد و سەت جنێوی پێ دەدا زێنەدین هارێک بوو، لە چاوی ماری نەدەگەڕایەوە. لە پۆلی پێنجی سانەوی بوو و خوێندەوارییەکی چاکی پەیدا کردبوو، شێعەلی ئیرەیی پێ دەبرد و ڕۆژ نەبوو داوای لێ نەکات فێری خوێندەواریی بکات، ئەویش گوێی پێ نەدەدا، قسە و داواکانی بابی وەک بایێک بوو بەبن گوێی دابێ. شێعەلی

زۆری مەراق خوێندەواری بوو و بڕیاریدا دانە ڕۆژێک بۆ دەوامی مەحوەلئومییە تەرخان بکات، بەڵکم ئەوە خوایە لەو گرێکوێرەی نێو دەروونی بە یەکجاری ڕزگاری بێت. شێعەلی بەخۆی و کورتەک و شەرواڵی نورت و نوێی و جەمەدانیی بەستانی نمرە پێنجی، ڕۆژانە لە دوای سەعات سێوە دەچووە وانەکانی بنکەی نەهێشتنی نەخوێندەواری لە تەیراوە، سێ مانگان بێ پسانەوە دەوامی کرد و خەریک بوو دەستوقەڵەم پەیدا بکات. ئێوارەیەکی هەینی، دیوەخانی شێعەلی لە مێوانی خزم و دەرودراوسێ و ناسیاو جمەی دەهات و زێنەدینی کوڕیشی قولینچکی دیوەخانەکەی گرتبوو و گوێی لە قسەوباسان دەگرت و باوکی باسی لە خوێندەوارییەکەی خۆی بۆ ئامادەبووان دەکرد. زێنەدین تۆزقاڵێ باوەڕی بە فشەفشەکانی شێعەلیی بابی نەدەهات، چونکە شێعەلی لە قسەوباسان زۆری پێوەدەنا و کونەبایەک بوو لەو گۆڕە. کە دەرکی هەنبانەی دەکردەوە، کڕبوونەوەی نەدەزانی. زێنەدین ڕقی لەو فشانەی بابی هەڵسا و لەنکاوڕا قیت بۆوە و چوو لەودیو کتێبێکی (مێژووی نوێ)ی پۆلی پێنجی ئەدەبیی هێنا و لەبەردەم شێعەلیی دانا و پێی گوت دە مادام خوێندەوارییت پەیدا کردووە،

ده دەی بەرگی ئەم کتێبەم بۆ وەخوینە. شێعەلی دەمێکی خۆش لە بەرگی کتێبی مێژووی نوێ ڕاما و چەندی سەر هێنا و برد، نەیزانی بیخوێنێتەوە، مەجلیس هەموو چاوەنۆڕ بوون شێعەلی بزانێ (مێژووی نوێ) بخوێنێتەوە، شێعەلی لاڵ و پت دامابوو و ئەوەی ڕەنگ بوو لە ڕووی نەمابوو، زێنەدینی کوڕیشی لەسەر سەری بوو. لەناکاو شێعەلی قیت بۆوە و (مێژووی نوێ)ی بە ( مشیر نووری) خوێندەوە!

زێنەدین لە قاقای پێکەنینێی دا و شیڕاندییە سەر بابی: کورە گووم لە خوێندەوارییەکەت شێعەلی، هەی دایکحیز ئەمە کەی خوێندەوارییە!

*بیرۆکەی خوێندنەوەی کتێبی (مێژووی نوێ)، کاک ف.پ بۆی باس کردم و لای من ئەم دەقەی لێکەوتەوە.

# سەلیم سێکوچکە

بە سێکوچکە ناویمان دەبرد، چونکە جارێک نەمانبینی لە دەرسەکانی نمرەی دەرچوون بێنێ، هەر سفر و سفر. سەلیم هێرۆهورێک بوو، حەشتەبای خوای نەدەزانی. عەبدوڵڵا فەندی ناوی نابوو سەلیم هێرۆ، بەڵام من ناوەکەیم کرد بە سەلیم سێکوچکە و لەو ڕۆژەوە هەموو بە سێکوچکە گازیان دەکرد. سەلیم تا پۆلی چواری سەرەتاییی هێنا و لەوێوە لووشکەیەکی لە مەکتەب دا، مەگەر وەلەکە عارەب لە حوشتر و ماکەری باشتەپەی لە عەلۆی دابێ. ساڵانێک دواتر سەلیمم لەکن مزگەوتی شێخەڵڵا بینییەوە، عارەبانەیەکی خنجیلانەی دانابوو، توور و سڵق و تەڕەتوولە و پەڕپێنە و سەرکەشێلمی دەفرۆشت، وەزع وەرسووڕا سەلیم چەفیەیەکی سپیی بۆر هەڵگەڕاو بە تۆزوخۆڵ و چڵکی شێخەڵڵای لەسەرنا و ناوەناوە لە مزگەوتەکەی ئەوێ پێشنوێژیی دەکرد. سەلیم سێکوچکە، ئێستا ڕسکاوە و

نۆکان بە نۆ پارووان ناخوا. کە ئیمامەتی دەکات، نزیکەی چوار سەت کەس نوێژی لەدواوە دەکەن، کە نوێژیش تەواو دەبێ دوو سەت، سێ سەت کەس دەمێننەوە گوێ لە وەعز و ئیرشادی دەگرن. زۆر سەیرە! ئێستاشی لەگەڵدابێ سەلیم سێکوچکە کە دەگاتە من هەر هێڕوهوڕەکەی جارانە و دەمی دەبێ بە تەڵەی تەقیو و هەر دەبێ گوێ شلکا و من ئامۆژگاریی بکەم، بەڵام فایدەی نییە، چونکە کا، بیر و ڕەوشەنیی تێناچەقێت.

## دۆخینەکەی موحسینە شێت

موحسینە شێت برا بچووکی هەیاسە شێتی کوورەچی بوو، موحسین پیاوێکی زەغەل و زەمتە بوو و لە ڕووی عەقڵەوە تامگێل بوو و دەتوانم بڵێم شێتێکی تەواو نەبوو، بەڵام ئەوە هەبوو کە وەک هەیاسی برای دەستی نەدەوەشاند و خەڵک لێی نەدەترسان، موحسین لە کۆتایی هەفتاکان دوکانەکانی پاڵ مزگەوتی حاجی حوسێن سمۆی سەر جادەی سی مەتریی کردبووە ماڵ و مەنزل و نیوەڕۆیانی لێ دەرچێ، بیست و چوار سەعاتی خوا لەو دەوروبەرە بوو، منداڵە وردکەی گەڕەک بۆ شەڕ پێ فرۆشتن و تووڕەکردنی، دەچوونە بەر دەمی و جنێویان بە هەیاسە شێتی برای دەدا. موحسینی بێدەسەڵات هەر ئەوەندەی وەڵام دەدانەوە:

کوڕە هەتیمینە ، هەی قەحپەشیرینە، جنێو بە هەیاس مەدەن با کوورەچییەکان نەزاننەوە، دوایی خۆشکتان دەگێن.

کوڕەکانی مەلا عەزیز کە ئێستا یەکێکیان دختۆرە، زۆریان دەرد دەدا موحسین و خراپیان پێ ڕادەبوارد، ڕۆژانە تەحسینیان دەچوو هەر بۆ سەیر و گاڵتە پێکردن، لە لاڕا شەرواڵە دۆخین لاستیکییەکەی موحسینی ڕادەکێشا خوارێ و تێی دەتەقاند، ئەسباب و مەسبابی موحسین دەکەوتە ئەو گۆڕەی، موحسین شێت و هار دەبوو و بەدوای تەحسین دەکەوت و کە بە شەپەشەپی شەرواڵەوە هەڵیشدەهات، هەرامەکەی دەکەوتە تەکەتەک، جنێو نەدەما بۆ ئەژداد و ئابائی تەحسینی نەنێرێ. ڕۆژێکیان مام حەمەدەمینی حاجی جەمیلی، موحسین بانگ دەکات و یەک دوو کۆنە شەرواڵی ڕەحمەتیی شەهید هاشمی کوڕیی دەداتێ کە لەچاو شەرواڵەکەی خۆی نورتونوێ بوون، موحسین دێتەوە و دەچێ لە مزگەوت شەرواڵە کۆنەکەی فڕێ دەدات و بە هیی نوێی دێتەوە بەردەم دوکانەکان، مورتاح و کەیفساز، لەناکاو تەحسینی لێ پەیدا دەبێتەوە و ئەویش خۆی مشەوەش ناکا و وەک جاران بە داماوی بە فەقیری بە جگەرەی لالێویەوە قیت دەوەستێ، تەحسین نزیک دەکەوێتەوە و دەست بۆ شەرواڵی موحسین دەبا و ڕایدەکێشێ تا وەک جاران لێی بێنێتە خوارەوە، توومەز دۆخینی

ئەمجارەی شەروالّی تازەی، دۆخینی تەواوە و لاستیکەکانی پێشوو نییە و شەروالّ دەچەقێ و نایەتە خوارەوە، موحسین بە پۆزێکەوە و بە جغارەی لالێویەوە تەماشایەکی تەحسین دەکا و پێی دەڵێ: هـای هـاااای.. جاری جارانە!!..

دەمەو نیوەڕۆیان موحسین بزر دەبوو و کەس نەیدەزانی کێوە دەڕوا، ڕۆژێکیان تەحسین لە مەراق ما بزانێ ئەو زەلامە کێوە دەڕوا، ئەوە بوو بن دیوار و بن دیوار بە دوایدا ڕۆیشت، بێ ئەوەی وابکا موحسین بزانێ بەدوایەوەیە، ئەو نیوەڕۆیە موحسین دیار نەما و مەلا عەزیز بانگی نیوەڕۆی دا و دوای ئەوەی مەلا سادق، قامەتی دا و لە (قد قامە الصلاە) بۆوە، بە وردی لە ڕیزی نوێژکەرانی ڕوانی و هەمووی دەناسینەوە، مشیراغا و سمایلاغا و حاجی جەمیل،حاجی هەمزە، مەلا قاسم و چەند کارمەندێکی دائیرەی ئەشغال و تەحسین و مەلا عەزیز خۆی و کوڕەکانی دهاماغا و ئاوێ بێنە و دەستان بشۆ، ئەو ڕۆژە مەلا سادق تەحسینی لە نێوانیاندا بەدی نەکرد، یەکەوسەر هەستی بە شتەک کرد، چونکە تەحسین بێی مەلا سادق نەدەبزوی، هەر بەتەواوی لە ژێر ئیتاعەی ئەوامری وی دابوو، پێشتر زۆرجاران ئامۆژگاریی تەحسینیشی دەکرد

کە ئەزیەتی موحسینە شێت نەدات، پێی دەگوت کورم بۆخۆت خەریکی دەرس و دەورەکانت بە، ئەمە خوا لێی گۆڕیوە و پێویستە بە هەمووان ئاگامان لێی بێ و هەراسان کردنی گوناهێکە و ناسڕێتەوە.

موحسین گەیشتە ناوەندی کۆڵانی عارەبان لای تەکیەی شێخ محێدین، تەحسین لە سەری کۆڵانەکە لای کۆگاکەی کتێبان لە پشت قوتابخانەی بۆتان، بە خشکەیی بەدوایەوە بوو، موحسین بڕۆ و تەحسین بەدوایەوە بڕۆ، تا گەیشتنە بەردەم یانەی فەرمانبەران، موحسین خۆی کرد بە دوکانەکەی مەڕبێنی ئارەق فرۆش کە بەتەک یانەکەوە بوو، تەحسین لەوبەر چاونۆڕی بوو تا هاتە دەرەوە و زەینی دایە شەرواڵە تازەکەی موحسین کە لەگەڵ ڕۆیشتنی، بەملاو بەولادا بە تەکەتەک کەوتبوو، تەحسین تێگەیی کە موحسین ئارەقی هێناوە، ئەمە بۆ تەحسین بووە مایەی واق وڕمان، موحسین ڕۆیی تا گەیشتە لای کەبابخانەکەی تەک مزگەوتی شێخەڵڵا و لەوێ دەیڕوانییە عەبدوڵڵای کەبابچیی خاوەن کەبابخانە و دیاربوو تەحسین گوێی لە موحسین بوو کە دەیگوت: عەبدوڵڵا، قۆندەرەکانی پێتم، عەبدوڵڵاش دیار بوو وەک هەموو ڕۆژان،

دوای کەمێک چەند کەبابێکی بۆ لەناو زەرف نا و بەڕێی کرد، موحسین هەڵتەک هەڵتەک گەڕایەوە و تەحسین بە دوایەوە تا هاتنەوە لای مزگەوتی حاجی حوسێن، تەحسین بۆماڵەوە و موحسینیش بۆ سەر سەکۆی دوکانەکان و دواتر وەرکەوتنی لەوێ تا دەمەو عەسر. شەوەکەی دوای نوێژی عیشا تەحسین نەچۆوە ماڵەوە و چاونۆڕیی موحسین کەوتە کەڵکەڵەی، موحسینیش وەختی خەوتنان ڕووەو قەبرستانی ئیمام محەمەد هەنگاوی نا و لەنێو کێڵە قەبرەکان بزر بوو. پاشتر خەڵکی لە سەربان نوستووی تەک قەبرستانەکە کە ماڵەکانی خدر خانچی و حەمیدی حاجی جەمیل و محەمەد هیندۆ و مەلا عەزەدینی لێ بوون، وەک هەموو شەوان لەگەڵ دەنگی تێکەڵی فیلمەکانی سینەمای هاوینەی سەلاحەدین و قۆریاتە نەشازەکانی موحسینە شێت خەو دەیبردنەوە.

# شەکیب شەقشەقە

شــەکیب شەقشــەقە، فەرمانبەرێکــی بەوەجــی حوکوومــەت بــوو، ملەســتوورێکی کەتــەی ســەر چوارقولینچکــی کەپــوو بەرانانیــی گــوێ دەفــی لچەســتووری ســمێڵ و ئەبــرۆ بۆیاغکــەرەوە بــوو. برادەرەکانــی بــە شــەکۆ شەقشــەقە بانگیــان دەکــرد، چونکــە لەماڵــەوە لەگــەڵ کچەزاکانــی هەر خەریکــی شەقشــەقانێ بــوو. شــەکۆ ســێ کچــی هەبــوو و هەرســێکی بەشــوو دابــوون، خــۆی و مامــزی ژنــی لــە ماڵــەوە مابوونــەوە. شــەکۆ لــە حوکوومــەت دەســرۆییو بــوو، نێوانــی لەگــەڵ گــەورە بەرپرســان مشــە بوو، بەشــەو بــەردەوام پێیەکی لای وەزیرێک یــان بەرپرســێکی گــەورەی حیــزب بوو، ســبەینانیش لــە دەوام بــوو و هێوارانیــش دەچــووە بــارەگای حیــزب و لــەوێ ســەری مەجلیســی چەقەچەقــە سییاســییەکانی دەگــرت و دەمودووێکــی هەبــوو ترەتــرێ بــە هەمــووان دەخســت. شــەکۆ هەفتەیەکــی مابــوو خانەنشــین بێــت، چونکــە دوای ئــەو هەفتەیــە

تەمەنـی لـە شەسـت و سـێ دەپەڕییـەوە و بەپێـی بڕیـاری پەرلەمانیـش هەر دەبـووا تەقاویـت بێـت، پرسـی تەقاویتییەکـەی هەراسـانی کردبـوو و شـەوانە خـەوی نەدەچووە چاوی. شـەکۆ شەقشـەقە لەگـەڵ ئـەوەی خـاوەن نـۆ باڵەخانـەی گـەورە بـوو لەنـاو شەسـتمەتریی هەولێـر و مانگانـە داهاتـی چەندیـن ڕیـزە دوکانیشـی بـۆ دەهاتـە ماڵـەوە لـە شـاری خەونـەکان، بـەڵام ئەوەنـدە دەسـقوچاو و پیسـکە و چڕدۆ و ڕەزیـل و چاوچنـۆک بـوو، گـەر ڕۆژێـک سـووکە مەسـرەفێکی هەبـا، بـۆ شـەوەکەی بـە داڵغـەی هەنـدێ، خەمـی دونیـای دەهاتـە کـۆڵ. ماوەیـەک بـوو دوای ئـەوەی فەرمانگـەی ئـاو، گێچـی ئاوپێویـان لـە مـاڵان بەسـتبوو، نێوانـی لەگـەڵ مامـز هـەر قڕەوبـڕە بـوو، چونکـە شـەکۆ دوای بەسـتنی ئاوپێوەکـە، داوای لـە مامـز کـرد چیتـر ڕۆژانـە حەوشـەی ماڵـەوە نەشـوات، بەڵکـوو بیکاتـە هەفتـەی جارێـک، ئیتـر وەک جـاران نەمـاوە بـە ئـارەزووی خـۆت ئـاو سـەرف بکەیـت، چونکـە ئاوپێوەکـە پـارەی زۆریـان لەسـەر تۆمـار دەکات.

شەکۆ لەجیاتیی ئیسراحەت و ئازادبوونی لە دەوام و دائیرە و کەوتنە ژیانێکی ئاسایی ئادەمییانە، خەفەتی تەقاویت بوونەکەی، دونیای لێ کردبووە چەرمی کێشکە. چاوی بە هیچ تێر

نەدەبوو. ئەو گوێی لێ نەبوو ڕۆژانە دەبووا بە ترومبێل نزیکەی سەعاتە ڕێیەک لە ماڵەوەڕا ببڕێت تا دەگاتە فەرمانگەکەی کە لە شارۆچکەی کەڵەک بوو، بیری لەوە دەکردەوە ساڵێکیتریش خزمەتەکەی نوێ بکاتەوە، کە ئەمەش لەدەست سەرەک وەزیرانە.

سەری هەفتە شەکۆ مەوعیدێکی لە نووسینگەی سەرەک وەزیران وەرگرت و لە دیدارەکەی لەگەڵ جەنابی سەرەکدا، داوای کرد ساڵێکی وەزیفەکەی بە پێچەوانەی باقی فەرمانبەران بۆ نوێ بکاتەوە. سەرەک وەزیرانیش بێئەوەی بۆ یاسا بگەڕێتەوە، یەکسەر بە بڕیارێکی سەر پارچە قاقەزێک، شەکۆ شەقشەقەی گەڕاندەوە فەرمانگەکەی، ڕۆژی پاشتر شەکۆ بەر لەوەی بچێتەوە سەر کارەکەی، بڕیاریدا هەندێ لە فەرمانبەرانی کاربەدەستی فەرمانگەکەی دەعوەتی سەیرانەگەشتێکی مەی خواردنەوە بکات. ئێوارەکەی سندووقی قەمەرەکەی پڕ کرد لە ئارەق و ویسکی و بیرە و براندی و شەمپانیا و ڤۆدگا، بەڵام لەگەڵ بابەکری ژمێریاری فەرمانگەکەی وەک چۆن لەمێژ بوو بۆ پارەوپوول کلکیان توند لێک گرێدابوو، لەسەر ئەوەش ڕێککەوتن کە سەرجەم مەسرەفی مەی و خواردنەکانی بۆ بکات بە پسوولەی کەلووپەلی پێویستی فەرمانگەکەی. ڕۆژی هەینی گەشتێکی خۆشیان بۆ لای کورداوە کرد و شەکۆ و برادەرەکانی و چەند بەرپرسێکی حیزبیش کە هێنابوونی، تا مڕ بوون بەدەم

چەقەچەق و فلّتەفلّتی سیاسەت و حیزب و سوێند بە خاکی پیرۆزی کوردستان و گۆڕی شەهیدان و هەڵوێستی پاک و مەردانەیان بەرانبەر گەندەڵی و گەندەلان، پەیمانە لەدوای پەیمانە هەڵیاندەقوڕاند.

شەکۆ دەستی بە دەوام کردەوە. سێیەم ڕۆژی دەوامی دوای بڕیاری گەڕانەوەکەی، شەکۆ شەقشەقە لە گەڕانەوەی لە دەوام، لەگەڵ لۆرییەک تامپۆنی کرد و شەکۆ بە سەختی بریندار بوو. ڕۆژی دواتر بە بڕیاری حیزب و سەرەک وەزیران شەکۆیان بۆ چارەسەری نارده ئەڵمانیا، دوای هەفتەیەک مانەوەی لە یەکێک لە نەخۆشخانەکانی هانۆڤەر، شەکۆ گیانی بە خاکی پاکی کوردستان بەخشی، حوکوومەتیش بڕیاریدا ناوی لە لیستی شەهیدان بنووسرێ و ژنەکەشی تا ماوە، مانگانە شەهیدانەی بدرێتێ.

دوای هەفتەیەک کە پرسە هەڵگیرا، هەر سێ زاوای شەکۆ، هاتنە سەر شانۆ و لەسەر وەرگرتنی کرێی ڕێزە دوکانەکان و باڵەخانەکانی شەکۆ پاک و پوختە و بێ قرەقڕ پێکهاتن و سەلاواتێکیان لەدیداری شەکیب شەقشەقە خوێند و بڕیاریاندا شەوی هەینی مەولوودێکی گەورە لە مزگەوتی جەلیل خەیات بگێڕن و پڕیکەن لە ئەشڕافی شار و شارستانانی هەولێر. خۆزگە شەکۆ چاوێکت لەوێ دەبوو.

## کێوە تانکەری بیر، کێوە؟

دەردە کورد بریتییە لە چاندنی ڕقوقینە، تەپشوو لە یەکتر وەشاندن، زەمکردنی پاشملە، ئیرەیی بەیەکتر بردن، یەکتر قۆپاندنەوە، چاو پێ هەڵنەهاتن، ڕاپۆرت لەسەر یەکتر نووسین، کۆسپ خستنە بەردەم کاروباری خەڵک، سووک تەماشاکردنی کاری جوانی بەرانبەر، غەدر لە فەقیروفوقەرا، داونانەوە بۆ یەکتر، ململانێی نابەجێی حیزبایەتی، قاچاندنەوە لە گەندەبەرپرس، کێشە بۆ خەڵک دروستکردن، ڕێزنەگرتن لە خزم و ناسیاوان، قۆڵبڕی و دزیی گەورە و زەبەلاح، پارە لەیەکتر خواردن، خیانەت لە ئیشوکار، بەحیزبیکردنی ناوەندەکانی پەروەردە و نەحەوانەوە لەگەڵ دراوسێ و خزم و کەس و لەگەڵ یەکتر، موزایەدەکردن بەسەر یەک و بە گەورە تەماشاکردنی دوژمن و ترسان لە کۆنە هین، برسیکردنی مامۆستا و لێدانی لە لایەن قوتابی، جنێودانی بێ موناسەبە، پیسوپۆخڵیی بەردەرگا وماڵەوە و خۆنەشووشتن، گەنیویی کڵاوجەمەدانی و

گۆرەوی و بنهەنگڵ بە هاوینان و دەست نەشووشتنی بەردەوام و تەنانەت لە ئاودەستەوە یەکسەر بۆ سەر خوان، ..... تا شتی قۆڕ و خلیچک بژمێری بنی نایە، وەک چۆن لە ماتماتیکا یەک تەقسیم سفر ئەنجامەکەی دەبێتە ما لا نیهایە، ئەم دەردە کوردەش کتومت وایە، هەموو لایەکی کوردەواریی گرتووەتەوە و دەریایەکە بنی نایە. وەرە ناو مامۆستایانی زانکۆ، ئەم قسە لەسەر ئەو دەکا، ئەو بەرپێنە دەداتە بەرپێی ئەو، ڕقی دنیایان لە کتێب و خوێندنەوەیە، ناو دختۆران هەر خراتر، لەناو دادوەری کەپوو بڵند و لمووز چەکوچانی و جاهیل، ناو هەندازیاران شەڕە لەسەر پرۆژەی فاشیل و سەقەت، ناو پارێزەر و فەرمانبەر و هونەرمەند و نووسەر و ڕۆژنامەنووس و توورفرۆش و ئاسنتاش و دارتاش و سەرتاش و کارەباچی و وایەرمان و فیتەر و تەپشووتراش و جڕتلێدەر و تەنانەت بیردەردەری ئاودەستیش. هەر دەردەکورد نێوچەوانت دەگرێتەوە. دەردە کورد لەناو بیردەردەری ئاودەست زۆر زەقە، بیردەردەران یەک خووی عەنتیکەیان هەیە، توخوا دەبا بۆتانی باس بکەم، لەوانەیە نەتانزانیبێ، ئەویش ئەوەیە بگەنە هەر دیوارێکی پاکوخاوێن، یەکەوسەر بۆیەکەیان دەردێنن تەماشایەکی ئەملاو ئەولا دەکەن و وەک ڕێکخستنە نهێنییەکانی جاران و (ژمارە مۆبایل و تەنکەری بیر)ی

لێ دەنووسن، ژمارەکانیشیان ئەغلەب وایە ژمارەی جوانن. بیردەردەرانی ئاودەست لە هەموو کەس زیاتر بەدەست دەردە کوردەوە تلاونەتەوە، تۆ بڵێ چیی؟ گریمان ئەمڕۆ بیردەردەرێکی ئاودەست هات و چاوی بەم دیوارە تازە بۆیەکراوە پاکوخاوێنەی مزگەوتەکەی بەرانبەرمان یان قوتابخانەکەی ئەودیو یان دیواری هەر ماڵێک کەوت، ئەوا یەکەوسەر لێی دێتە خوارەوە و سپرای بۆیەکەی لە تەنکەی باخەڵی یان لە شەرواڵە گوواوییەکەی دەردێنێ و (ژمارە مۆبایل و تەنکەری بیر)ی لێ دەنووسێ و تێی دەتەقێنێ، پاشتر بە ڕێکەوت تەنکەرێکی تر بەو ناوەدا دێ و چاوی بە دیوارەکە و ژمارە مۆبایلی تەنکەرەکەی پێشوو دەکەوێ، یەکسەر ئیرەیی و خوێڕیاتیی هانی دەدا بێتە خوارەوە و ژمارە مۆبایلی تەنکەری پێشوو بسڕێتەوە و بە ڕەنگێکی تری بۆیە، هیی خۆی لێ بنووسێ، ئیتر زنجیرەی ژمارە مۆبایل نووسینەوە و سڕینەوەی تری بەدوادا دێ و دیوارم دیوارە، دەبێتە گووخانەی تانکەری بیر و مەگەر خوا بزانێ بە تابلۆی چ هونەرمەندێکی شێوەکاری سریالی دەچێ! خەریکە دەڵێم دیوارەکانی پایەتەختەکەمان هەمووی بووەتە ژمارە مۆبایلی گوودەردەران و گوێڕاکێشێکیش نییە تەنبێیان بکا. عارەب گوتەنی (منو بلمنو هەولێر صار قەرەباڵغ). تۆ بڵێی دانیشتووی ئێرە هەر خەریکی بخۆ و بڕی

بن؟ زۆر سەیرە ئەم خەڵکە هەر خەریکی گوواندن و ڕیخاندنن! هەمووجار بیردەکەمەوە و دەڵێم خوایە گیان ئەم هەموو تانکەرە، ڕۆژانە ئەم هەموو تەپاڵەیە کێوە دەبەن؟ عەیب نەبێ کار وا بڕوا کوردستانی خاکی ڕەنگاوڕەنگی گوڵگوڵی دەبێتە گووخانەی تەنکەران! کێوەی دەبەن خوایە گیان؟ هاوکێشەیەکی قورسە، قەتم سەر لێ دەرناچێ، بۆم شیکار نابێ، بە قەبری بابم هاوکێشەکانی ماتماتیکم لەکن ساناترن!

## داڵغە

ئەمڕۆ سەباح ی هاوڕێی قوتابخانەمم لەسەر پردەکەی سەیداوە بینی کە کاتی خۆیشی بەهۆی ئەوەی تەختەیەکی تەنکی نوقسان بوو و ئەوان ڕۆژان چەندی هەوڵم لەگەڵیدا و سووتام و برژام ئەوەندەی ماتماتیکیشی بۆ شەرحکەم، کەچی مەیلی لە خوێندن نەبوو و مەکتەبی پێ تەواو نەکرا، سەباحم دە ساڵ زیاتر بوو نەدیبوو و ئەوکات خەریکی دەسگێڕی و کەسابەتی ناو بازاڕ بوو، کەچی ئەمڕۆ بینیم کارتە جۆراوجۆرەکانی مۆبایل و ئەنتەرنێتی بۆ فرۆشتن بەدەستەوە بوو بۆ فرۆشتن. سەباح ئێستایشی لەگەڵدا بێ هەر وڕوگێژەکەی جەفتاکانە و هاڕەی لێوە دێ، کە ئەمڕۆ بینیم ئەو ئاگای نە لە من و نە لە حەشتەبای خوا هەبوو، لەسەر پردەکە داڵغەیەکی قووڵ بردبوویەوە و کە بانگم کرد هەندەی لەخۆی هەڵدا و منی ناسییەوە، گوتمێ توخوا سەباح ئەوە داڵغەی چیت لێدا بوو و بیرت لە چی دەکردەوە؟

سەباح دەیویست خۆی بپچڕێنێتەوە و خۆی لە وەرامی پرسیارەکەم بدزێتەوە، من لێی نەگەڕام، سەباح گوتی وەڵڵا برام لە داڵغەی ئەوەدا بووم ئێستا ملیۆنێ دۆلارم هەبا چۆنم خەرج دەکرد و بە چیم دەدا، هەردووکمان لە تریقەی پێکەنینێمان دا. گوتم سەباح چۆن ژیانت بەو کەرایەتییەی بردۆتە سەر. بەڵام سەباحۆک تۆ داڵغەکەت هەر لێداوە لێداوە، لە داڵغەش هەر لای کەمەکە دەگری؟ باشە بۆ داڵغە بۆ سەت ملیۆن دۆلار لێنادەی، بۆچی بۆ یەک ملیۆن دۆلاری حیزی لێدەدەی؟ یەک ملیۆن دۆلار کوا پارەیە! کردمانەوە پێکەنین.

# جومعە شێت

سبەینەیەکی زووی سەرەتای هەشتاکان، شەڕی قادسییە لەگوڕێ بوو، جارجارە فڕۆکەکانی ئێران کوێرانە هەولێریان دەکوتا. دایکم لەخەوی سەربان بەئاگای هێنام و گوتی بڕۆ نانی فڕنی بکڕە، منیش بەچاوی جیقاوییەوە لەخەو ڕابووم و قۆندەرە لاستیقەکەم لە پێ هەڵکێشا و دوای دە دەقیقە گەیشتمە نزیک نانخانەکەی کۆڵانی عارەبان، دیتم جومعە شێت لەبن قەپەنگی ئەو دوکانەی لەم وێنەیەدا دیارە، لینگی لێ ڕاکێشاوە و بەکامی ئیسراحەت مەلیکانە خەوی لێکەوتووە، تومەز شەوانە ئێرە شوێنی خەوتنیەتی! تەحسینی دادە ئایشێ و یەکدوو شەللاتیی کۆڵانی عارەبان بەوێدا هاتن و تەماشایەکی جومعەیان کرد، دیتییان جومعە نوستووە. لەتەنیشت قەپەنگەکە دوکانێکی داخراوی شفتیفرۆشی هەبوو و شفتییەکانی بە پەڕووپاڵ داپۆشرابوون و چەند شفتییەکیش بەدەرەوە بوون، تەحسینی ئایشێ کە پیسترین قامەی گەڕەک بوو، خوا بیژیی وەک خۆی لە هیچ مەفتەنان

نەخوڵقاندبوو، کە جومعەی بە نوستوویی بینیی، هەر بۆ ڕابواردن و ئیشی قەڵپ و ناجۆر، پڕیدا شفتییەکی زل، بە هەردوو دەست دوو لایەکەی گرت و بە شێوەیەکی ئاسۆیی شفتیی گرتە دەست و بەرزی کردەوە سەر سەری خۆی و دوو سێ هەنگاو چووە دواوە، ئەمجارەیان هەنگاوێکی گەورە قاچی ڕاستەی هێنایە پێشەوە، بە شێوەیەک لینگی بە تەواوی لێک بووەوە، تا هێزی تێدا بوو شفتیی ڕاوەشاند، شفتی دەتگوت دەفرە فڕیوەکانی ئاسمانە لە هەوا دەفڕیی، شفتی بەو خێراییە زۆرەوەی بە قەپەنگە داخراوەکە کەوت، تەحسین شفتیی بە قەپەنگی ئەو دوکانە دادا، ڕمبەی قەپەنگ دەتگوت دەنگی ناپاڵمە کەوتە بەر گوێ، شفتی بووە هەزار پارچە، جومعە لەگەڵ ڕمبە گەورەکە یەکسەر قیتبۆوە و زراوڕژاو ببوو و بەهەموو هێزی خۆی غاریدا، جومعە دەتگوت کێشکەیە دەفڕیی، لەترسان بەچەند چرکەیەک لەبەرچاو ون بوو، تەحۆ و سەرسەرییەکانیش دەستیان کرد بە حیتوهۆڕی پێکەنینێ.

ئەمە وەزعی ڕۆژانەی شێتەکانی هەولێر بوو لەدەست منداڵەوردکە و شەللاتییان!

# حەیدەر حالۆری

حەیدەر حالۆری بەمنداڵی لەخوێندن گەلێک خراپ بوو، سەروکەللە و لووتێکی بەرانانیی هەبوو، لە پۆل داکەسانی نەبوو، مامۆستاکانیش خۆشییان لە چارەی نەدەهات، تەنبەڵێکی کەم وێنە بوو، زۆریش بزێو بوو، حەیدەر لە پشووی نێوان وانەکان، یەکەم کەس بە غار دەگەیشتە سەر مام سمایلی حانووت و سەندەویچێکی هێلکەی وەردەگرت، تا دوا پشوو ئەو چوار سەندەویچی وەک برێژکە ئاودیو دەکرد، بۆیە ناسناوی حالۆرییان دەقەبەڵ خستبوو و ئەویش هیچ بەم ناسناوە مشەوەش نەدەبوو. هەرجارێ مامۆستا قاسمی کوردی هەڵیدەستاند و پرسیاری لێ دەکرد، حەیدەر وەک بت لەسەر قاچەکانی دەمەیی و متەقی لێوە نەدەهات، مامۆستا قاسم هەرچیی لێ دەپرسی، ئەو هیچی نەدەزانی، ڕۆژێکیان مامۆستا قاسم تێی ڕاخوڕی:

- حەیدەر، هەستەوە کورە هەی قەحپەشیر.
- بەرێ مامۆستا.

حەیدەر زۆر لە مامۆستا قاسم دەترسا، مامۆستا قاسم لێی پرسیی:

- حەیدەر حالۆری، دێڕە شیعرێک هەیە بۆتی دەڵێم، بزانم دەزانیی هیی کێیە.

- بەسەرچاو مامەستا.

مامۆستا قاسم ئەم دێڕە شیعرەی خوێندەوە و گوتی حەیدەر حالۆری دەبێ تۆ ناوی شاعیرەکەیم پێ بڵێیت، من ناوی چوار شاعیرت بۆ دەڵێم بزانم دەزانیت هیی کامیانە:

(شەرابی لەعلی ڕوممانی لە نالی
حەرامە بێ مەزەی ماچێکی لێوان.)

مامۆستا قاسم بۆ زیاتر ئاسانکاری وشەی نالیی بە دەنگ و ئاوازێکی گەورەتر دووجاران گوتەوە.

دەی حەیدەر ئەم دێڕە شیعرە هیی کام لەمانەیە:

( نالی، مەولەوی، پیرەمێرد، گۆران)

حەیدەر یەکەوڕاست وەرامی دایەوە:

مامۆستا ئەمە شیعری مەولەوی یە.

تێکڕای پۆل دایانە قاقای پێکەنین.

مامۆستا قاسم ناچار ما گوتی ئافەرین حەیدەر ئەمە چۆنت زانی؟ دیارە زۆر دەخوێنیت.

حەیدەر گوتی:

گەلێ زۆر دەخوێنم مامۆستا، بەڵام هەر ساقیتیش دەبم.

حەیدەر حالۆریی بێ بڕوانامەی بە پلەی بەرز
خانەنشین، ئێستا دەقنووسێکی بەناو و دەنگە
و کە بە قات و بۆینباخ و پایپی دەستیەوە دێتە
مەجلیسێک چەندین ڕەخنەگر و شرۆڤەکار لەبەری
هەڵدەستنەوە و خاوەنی چەن دیوانە شیعرێکیشە
و چەندین ڕەخنەگر و مامۆستای زانکۆ، بە زنجیرە
لێکۆڵینەوەیان لەبارەی دەقەکانیەوە نووسیوە و
چەندین خەڵاتی موهیممیشی دراوەتی، بەڵام قەسەم
بەو خوایە ئێستایشی لەگەڵدا بێ هەر حالۆرییەکەی
جارانە و باوەڕیش ناکەم هەنووکەیش فەرقی نێوان
عەین و حێ بکات.

## سەلیم سۆتکە

سەلیم سۆتکە تازەکانە لە هەندەران گەڕابۆوە، لەوێ گونلەمست هیچی بەهیچ نەکردبوو و هاتبۆوە لێرە فشەفشی لەسەر برادەرانی دەکرد، گوایە مسەققەف بووە و لە ڕەفتار و کردەوەی ئەوان دڕدۆنگە، زۆر دەگەڕا ئیشێکی دەستکەوێ بەڵام لەبەر ترۆتۆپەستووری نەدەکارا ئیشان، ئەو خۆی بە گووێکی گەورە دەزانی و لە قسە و گفتولفتیدا هەر ناوی ئەم وەزیر و ئەو بەرپرسی دەهێنا گوایە برادەری گیانیی هەموانە، خۆی بەلاوە کەسایەتییەکی گەورە بوو، کەچی کەس حسێبی دوو فلسی سۆتیی بۆ نەدەکرد. هەموو جار کە دەهاتە چایەخانەی مەچکۆ دەبایە پارەی چایەکەی بدەین، خۆ ئەو دایما موفلیس بوو، گەر هەشیبا فلێس بوو، دەستی لە بەرکی ڕانەدەکرد، سەلیم سۆتکە وەختی خۆی لە ڕۆژنامەی هاوکاری بەهۆی شێخێکی خزمی کە جاشێکی گەورە بوو، ئیشی بەردەستی بۆ

دەزگاکە بە پاداشت دەکرد، بیری کردەوە هەر ئەمڕۆ سەرێکی شێخەی خزمی بداتەوە بەڵکم ئەمە خوایە ئیشێکی میدیاکاریی بۆ وەدۆزێ.
سبەینێ چێشتانان سەری شێخەی لە ڕۆژنامەی زمانحاڵی حیزب دا، لەوێ شێخە پێشنیازی نووسینەوەی بیرەوەریی بۆ سەلیم سۆتکە کرد، سەلیم ئەو پێشنیازەی زۆر بە عەقڵدا چوو، شێخە بە سەلیمی گۆت: کەسایەتییەکی گەورەی وەک تۆ کە هەم ڕۆشنبیر، هەم سیاسی، هەم کۆمەڵایەتی، هەم بیرمەند و ڕۆژنامەنووس، وەرە لێبکشێوە بیرەوەریت بنووسەوە، بەشەرەفم بە یەکەم چاپی کتێبەکەت، پاروت دەکەوێتە ڕۆنی هیزە.
سەلیم سێ مانگان لە کونی ژوورەوە نەهاتە دەرەوە، خەریکی نووسینەوەی بیرەوەری بوو، کە لێبۆوە، سەری شێخەی دایەوە و بیرەوەرییەکانی نیشاندا، بیرەوەری چ بیرەوەری! مەگەر ئەحمەد ڕۆڕۆ سەری لێ دەربچووبووایە!
شێخە، سەلیمی ناردە چاپخانەیەک و کەمێ پارەی بە قەرز دایێ و پێیگوت: ئەویتریش خۆت بیخە سەر و کە کتێبت فرۆشرا پارەکەم بۆ بێنەوە.
سەلیم ئەم دەرگا و ئەو دەرگای کوتی و بە قەرز و قۆڵە ئیشەکەی پێکهێنا. بیرەوەری بە چاپی بەرگ ئاوزێڕی ڕەقی جزووبەند لەچاپخانە هاتە دەرێ،

سەلیم ئاهەنگێکی خنجیلانەی بۆ دابەشکردنی بیرەوەرییەکانی لە بنکەی ڕۆشنبیریی شار بۆ سازدا و لە ئاهەنگەکە داوا کرا ئامادەبووان سەر و کتێب وەرگرن و پارەی کتێبەکەش دانێن، نەک وەک دیاری، بەڵکوو دەبێ بیکڕن، ئاهەنگ تەواو بوو لە شێخەی جاش زیاتر زەلامی خوا دانەیەکی گل نەدایەوە، هۆڵە بچکۆڵەکە هەندەی دەمێ چۆل بوو.سەلیم تەنگەتاو بوو، شێخە بەپێشنیازیترەوە دڵی سەلیمی خۆش کرد و گوتیێ: سەلیم تۆ واچاکە ژمارەیەکی باشی ئەم کتێبەت لە ئاهەنگێکی دیکە بە فراوانی، بە دیاری دابەش بکەیت و ئەوکات ناوبانگت زۆر زێتر دەڕوا و واش باشترە هەر کتێبێک لەو ڕێوڕەسمەدا کە دەیدەیتە یەکێک، با وێنەیەکت بۆ بگیرێ تا لە ئەکاونتی خۆت لە فەیسبوک دایبەزێنی، بەمجۆرە کتێبت هەڕمێنی زیاتر دەبێ و خەڵک بەدوایەوە دەبێ و ناچارن لە بازاڕ بیکڕن، سەلیم وای کرد و فەیسبوکی پڕ کرد لە ڕەسمی خۆی لەگەڵ خەڵک، کتێب هەڕمێنی پەیدا کرد و لە بازاڕ نەما، بەڕکی سەلیم ماوەیەک باش گەرم بۆوە، ئەمجارە شێخە سەری لەبن گوێی سەلیم نا و دایە بەر پێشنیازان: سەلیمۆکی سۆتکەی سەیانی، بەخوای من نەبم کەس گوو بە کڵاوە بۆرەکەت

ناپێوی، وەرە ئێستا لێ بکشێوە ڕەسمەکانی فەیسبوکت بکە کتێب، ئەوانەی لە ڕێوڕەسمەکەدا بیرەوەرییەکانت لێ دابەش کرد. سەلیم پێشنیازی جوانی شێخەی کەوتە دڵ و ئەلبوومێکی چاپ کرد و چەندین وێنەی سەردەمی گەنجی و هەندەرانیشی هاویشتێ، کتێب لە چاپخانە هاتەوە و ئەویشی لە ڕێوڕەسمی شاهانەدا بە شرقوهۆڕی وێنە گرتنەوە دابەش کرد و قەولە وێنەکانی ئەویش بکاتە کتێب، ئیتر ئەم بەزمەی سەلیم سۆتکە وەک هەقایەتی مێشێ بنی نایە و کۆتایی نییە، هەر کتێب چاپ دەکات و ڕەسمەکانی دابەشکردنی دەکاتەوە کتێب. ئێستا سەلیم بەو حاڵ و وەزعەوە خاوەنی هەشتا تا نۆهەت کتێبە، لەسەر پێشنیازی تازەی شێخە، قەولە سەلیم قژ بەرداتەوە بۆ ئەوەی هێشتا زیاتر بەناوبانگ بێ، شێخە دەڵێتە سەلیم: سەگبابم ئەگەر وا نەکەم سەت ئەوەندەی ئاینشتاین بەناوبانگ بیت، هەی لە قەبری بابی ئاینشتاینیش بەم گەر نیو ئەوەندەی تۆ ئەقڵی لە کەللەدا بێ!

## شەفەی شێلم

سـاڵانێکی زۆر بـوو پەراگەنـدەی وڵاتـان بووبـووم، ئـەوە چەنـد سـاڵێکە کەڵکەڵـەی گەڕانـەوە بۆ کوردسـتان مێشکی تەنیوم و هەراسانی کردووم، لای هاورێکانـم باسـی سـەفەرم کـرد بـۆ کوردسـتان، جـارێ سـەرەتای ڕاپەڕینەکـە بـوو، مەگـەر تاکوتـوک لـە کـوردان بـە سـەفەر گەڕابنـەوە، وەک باسـیان دەکـرد تـا دەگەیتـەوە کوردسـتان ئەوەنـدە زەحمەتیـی ڕێـگا دەبینـی، هەمـوو خۆشـییەکت لـێ دەبـێ بـە سـندان و قوزەڵقـورت، بـەڵام چـی بکـەم غەریبیـی دایـک و بـاوک و خـزم و دۆسـت و یـاران بڕسـتی لەبـەر بڕیوم، بۆیـێ بڕیـاری قەتعیـم ئـەوە بـوو بـۆ دە ڕۆژێـک بچمـەوە شـار. دەنگـۆی گەڕانـەوە و سـەفەرەکەم لەنـاو کوردانـی ئـەو شـارەی لێیـم، بـە فراوانـی بڵاوبـۆوە، جـا تەکلیفـی دۆستانیشـی هاتـە سـەر، زۆر لـە هاوڕێیانـم هەنـدێ کەلوپەلـی بچـووک و دیـاری و نامەیـان وێـدام تـا بیانگەیەنمـە کەسـوکاریان، منیـش هەموویـم لـێ

وەرگرتن و لەنێو جانتایەکی گەورە لەگەڵ جلک و شتەکانی خۆم تەقەتم کردن، بۆ ئەوەی لە هەولێر بیانگەینمە خاوەنەکانیان، دوای چەند ڕۆژێک جگە لە نامەی (شەفیق شێلم) ی دۆستم کە بۆ باوکە پیرەکەی خۆی نووسیبوو، هەموویم گەیاندن. شەفە شێلم لە هەندەران لە هیچ بۆنەیەک نەبوو بۆ شێلمی کولاوی تەعجیل نەگریێ، بۆیە کوردانی ئەوێ ناویان نابوو (شەفەی شێلم)، من و شەفە برادەر بووین و من زۆریش چاکە و پیاوەتیم بەسەریەوە هەبوو و گەر منیش نەبوومایە دەبووا ئێستا شەفە لە هەندەران گەدایی بکات، بەهۆی منەوە وەک پەنابەر وەرگیرا و زۆرجاری تریش یارمەتیی جۆراوجۆریشیم داوە، من مەبەستم ئەوە بوو کە دەچمە لای باوکی شەفە، نەختێ لایان دانیشم و باسوخواسی شەفەشیان بۆ بکەم و لەوەش دڵنیایان بکەمەوە کە شەفە لە وەزع و تەندروستییەکی باش دایە، بۆیەش نامەکەم چەند ڕۆژێک دواخست. ئێوارەیەکیان بەرەو تەعجیل ملی ڕێم گرت و بە پرسیار و سۆراغ ماڵی حاجی حەسەن سۆبەفرۆشی باوکی شەفەم دیتەوە، دەرگای ماڵیان دوودەرییەکی شین بوو، دەکەوتە کۆڵانی پشتەوەی مزگەوتەکەی مەلا نەبی، لە دەرگام دا و دوای دەمێکی خۆش حاجی حەسەن

دەرگای کردەوە، منیش خۆم پێ ناساند، حاجی حەسەن یەکەوسەر هەردوو ڕوومەتی ماچ کردم و بە خۆشحاڵییەکی یەکجار زۆرەوە پێشوازیی لێ کردم، کە چوومە ژوورەوە دایکی شەفە لە بنەبانێ لەبەر سۆبا عەلائەدینەکە هەڵتروشکا بوو، هەردووکیان زۆر بە گەرمی بەخێراتنیان کردم، دوای باسوخواسی دەرەوە و شەفەی هاوڕێم، نامەکەم لە بەرکم دەرهێنا و گوتمێ ئەمەش نامەیەکی کاک شەفیقە بۆ ئێوەی ناردووە و با منیش لە خزمەتتان مەرەخەس بم، هەردووکیان سوێندیان خوارد کە نابێ بڕۆیت تا نامەکەی شەفیق گیانمان بۆ نەخوێنیتەوە، هەردووکیان گوتیان ئێمە نەخوێندەوارین، چوزانین نامان بخوێنینەوە، تۆ چاکە و پیاوەتییەکەت هەر کردووە، دە نامەکەشمان بۆ بخوێنەوە بزانین چیی بۆ نووسیوین. ناچار دانیشتمەوە و زەرفی نامەکەیان بۆ هەڵپچڕیم و دایانە دەستم. نامەکە پڕی بوو لە سلاو و چاکوچۆنی و ئەحواڵ پرسینی خۆیان و خزموخوێشانیان.

لە کۆتایی نامەکە شەفەی شێلم ئەم ڕستەیەی بۆ دایک و باوکی نووسیبوو:

بابە گیان

دایە گیان،

زۆرم مەبەست بوو بڕێک دۆلارتان بۆ بنێرمەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی هەڵگری نامەکەم پیاوێکی سەر ڕاست و دەسپاک نییە، بۆیە بە باشم نەزانی پارەتان بەودا بۆ بنێرم، لە دەرفەتێکیتر و لەگەڵ یەکێکی جێی باوەڕ بە زووترین کات مەبلەغێک دۆلاری چاکتان بۆ ڕەوانە دەکەم.

کوڕی خۆتان: شەفیق

## بدەبەرێ

ئـەوێ سـاڵێ وەفدێکـی شـوێنەوارناس لـە بەریتانیاوە ڕوویـان لـە وەزارەتـی ڕۆشـنبیری کـرد، لـەوێ چوونـە کـن وەزیـر بـۆ ئـەوەی ڕێوشـوێنی پێویسـتیان بۆ دەستەبەر بکات تـا بتوانن شـوێنەوار و کۆنینـە و دێرینـەکان بەسـەربکەنەوە.

قـادر قازکـوژ کـە تـازە پۆسـتی وەزارەتـی ڕۆشـنبیریی وەرگرتبـوو، تەلەفۆنێکـی بـۆ کەریـم کەسـتەکخۆری بەڕێوەبـەری شـوێنەواران کـرد:

هەلەو، کەستۆ لەکوێیت؟

وەڵلا جەناب وا خەریکی نانخواردنم.

دەست لە نانخواردنەکەت هەڵگرە، زووکە وەرە وەزارەت و وەفدێکی ئینگلیزان لێرەن، دەیانەوێ گردی کلکمشک بەسەربکەنەوە و پاشان بیانبە شوێنەوارەکانی قارینچاغا و فشکەبابڕوا و گوێمەدێ و خانزادخان و تەپەی عولەشێت.

کەریم کەستەک دەستی لەناو پارووە نانەکە مەیی، لە ترسی جەنابی وەزیر، زوو بەخۆکەوت و

بۆینباغه گەچڵاوەکەی خستەوە مل و بەڕێ کەوت.

کە گەیشتە وەزارەت، وەفدەکە لە چاوەنۆڕی بوون، هەموویان سواری لاندکروزەرێک بوون و چوونە گردی قارینچاغا، لە گردێ بەسەرکەوتن.

کەریم وەک شوێنەوارناسێکی مەعلان، بە پۆزەوە کەوتە باسوخواسی شوێنەوارەکان:

- ئەمەی دەیبینن ئەوە گۆڕی مەهتاسب گاردانای پاشایە، مێژووی ئەم گۆڕە بۆ ٤٥٨٨ ساڵ بەر لە زایین دەگەڕێتەوە.

- ئەم دیوار و گۆسکەیەتان بینیوە؟ ئەمە ماڵی باپیرە گەورەی پانیپاڵە و مێژووەکەی بۆ ٥٤٩٨ ساڵ بەر لە زایین دەگەڕێتەوە.

- ئەم بەردە زلە و قاپوقاچاخە مسانەتان دیتییە؟ مێژووەکەی ٣٥٤٧ ساڵ بەر لە زایینە.

شاکر پاسەوان لەولاوە وەستابوو، هەر تەماشای دەمودووی کەریمی دەکرد، توومەز سەرنجی لەوە دابوو کە کەریم کەستەک هەر جارەی ژمارەیەک لەبارەی مێژووی شوێنەوارەکانەوە بۆ نێردە بیانییەکان دەڵێ، بۆیە ئەمجارەیان بەرگەی خۆ کڕکردنی نەما و هاتە دەنگ:

ئەرێ مامۆستا کەریم، جەنابت ئەم ژمارانەت لە کوێ هێناوە؟

شاکرۆک، کڕبە کورە هەتیمی قەحپەشیر، ژمارە چییە! بدەبەرێ.. چما گەوواد هەیە بڵێ وا نییە؟!

# کاولە مەفتەن

نزیکەی بیست ساڵ دەبوو لە هانۆڤەر بووم، ڕۆژێکیان سەمیر هەمەوەندیی برادەری گەڕەک لە کۆڵنەوە تێلی بۆ کردم، گوتی: برام، ئەوە موعتەسەم دامرچیی هاوڕێمان دوو ساڵ دەبێ لە کەمپەکانی ئێرەکانەیە و هەر چاوەڕێ بوو حکوومەتی ئەڵەمان شتێکی بۆ بکەن، کەچی بەداخەوە دوای ئەم هەموو هەوڵە، پارێزەرەکەیشی هیچی بۆ نەکرا و دوێنێ ئێوارە خەبەریان داوەتێ کە ڕەفزی بۆ هاتووەتەوە، داماوە ئەویش تێلی بۆ کردم، گوتی: دوا بڕیارم ئەوەیە بگەڕێمەوە هەولێر و چیتر حەوسەڵەی ئەو دەردەسەرییەم نەماوە. بۆ ئەو کێشەیەی کوڕە جوانەکەی هاوڕێی سەرەتایی و ناوەندیم موعتەسەم دامرچی، غەمێکی توند دایگرتم، بیرم لە شەوە خۆشەکانی بەیەکەوە بوونمان کردەوە لەگەڵ موعتەسەم، کە گەنج بووین، هێشتا ژنمان نەهێنابوو، ئەغڵەب ئێوارەی بەهاران، دوای مەغریب، من و ئەو و سەمیر و زەینەل قاسم کوورەچی و خدر خەمخۆر ئازیکەندی و بیلال بێدڵ گەرمیانی، بەرەو

مەحەتە شۆڕ دەبووینەوە، تا درەنگانی شەو لە نزیک ویستگەکەی شەمەندەفەر کە دواتر کرا بە بەندیخانەی مەحەتە، بە دزییەوە بەدەم خواردنەوەوە دەماینەوە، لەوێ گوێمان لە قۆریاتە خۆشەکانی موعتەسەم و حەیرانە پڕ لە غوربەتەکانی خدر خەمخۆر و ئای ئای و ئەڵڵا وەیسییەکانی بیلال دەگرت، خۆ گەر ڕۆژێک خدر نەهاتبووایە، ئەوا من بە دەنگە کەرخەکەمەوە دەستم بە حەیران گوتن دەکرد.

ئۆۆۆف، دەردی غوربەت و دووری ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هەناوم بنکۆڵ دەکات، میشکم دەکاتە خمخانە، وەیش چەندە بیری کۆترە سابوونییەکانی جەلیل جامچی و نۆکاوە خۆشەکەی کەریم ئیبۆ و دۆندرمەکەی مام جەردیس و کێشکەی کۆلاو و عەسەلیاتەکەی شەریف و شەربەتەکەی کاوە کەمتەرخەم دەکەم. سەمیر گوتی: برام، بە یادی جاران هەر بەم بۆنەیەوە، سبەینێ دەمەو عەسر سەعات چوار، لە دەو ئاوەکە هەردووکتان دەعوەتی منن و ئێوە هەر خۆتان وەرن و من خواردن و بیرە و ڤۆدگا و لیمۆ و چەرەزات دێنم و لەوێ لێی دادەمەزرێین. عەسر لەماڵەوە بەپێ کەوتمە ڕێ، دوای نیو سەعات گەیشمە دەو ئاوەکە، لەوێ لە شوێنێکی لاچەپ، هەردوو هاوڕێی دێرینم دۆزینەوە، دوای هەژدە ساڵ چاوم بە بینینی موعتەسەم ڕوون بووەوە، چاکوچۆنی و ئەحواڵ پرسین و قسە و گفتولفتی خۆش و گێڕانەوەی هەندێ یادگاریی

ساڵانی لەوەبەر، کەوتینە خواردنەوە، گەلێک نوکتە و قسەی خۆشمان کرد، کەشوهەواکە زۆر فێنک بوو، ئەملا و ئەولای زێیەکە پڕی خەڵک بوو، تیایاندا بوو خۆی و سەگەکەی، هەبوون دوو دوو و سێ سێ بە سەگە جۆراوجۆرەکانیانەوە دانیشتبوون، هەریەکە خەریکی خواردن یان خواردنەوەش بوون، سەیرانێکی خۆش بوو و کەس ئاگای لە کەس نەبوو، تا ڕاددەیەک کشوماتییەک ئەو ناوەی گرتبووەوە. دەمێک بوو گوێم لە قۆریات و مەقامات و دەنگە خۆشەکەی موعتەسەم نەبووبوو، بیرم لە حەیرانە پڕ لە سۆزەکانی خدر و ئایئایەکەی بیلال گەرمیانی دەکردەوە، سۆزێکی توند بۆ ساڵانی بەسەرچوو دایگرتم. سەمیر ڕووی کردە موعتەسەم و گوتی: دامرچی گیان، لەمێژە گوێمان لە قۆریات نەبووە، توخوا بۆ تێی ناچریکێنی؟ موعتەسەم سەرەتا ملی نەدەدا، پاشان منیش داوام لێی کرد بیڵێت، ئیتر وردە وردە نەرمی کرد و لەناکاو دەستی لەبن گوێی نا:

ئەغاااام ئەغاااام
ایچم ایچم
قۆی مانی ایچم ایچم
باخما اوزوم گولورو
وێراندی ایچم ایچم.

ئەوەی سەیر و عاجباتی بوو لای ئێمە و خەڵکانی دانیشتووی ئەو ناوە، لەگەڵ هەر تێهەڵکردنێکی موعتەسەم بە قۆریات و ئەغاام

ئەغاااام و هەڵسانەکەی، سەگەکانی ئەو دەوروبەرە، سەگەکانی ئەو خەڵکەی ئەوێ تێکڕا دەستیان بە حەپە حەپ کرد. هەر واقمان وڕما. لەناکاو موعتەسەم بێدەنگ دەبوو دەیگوتە من: ئەرێ ئەوە چی بووە؟ چ قەوماوە ئەم سەگوەڕە چییە؟ کاتی خۆیشی سوعبەت و قسە و جنێوی جۆراوجۆر لە نێوان من و موعتەسەم هەبوو، ئیتر بە هەلم زانی لەگەڵە بکەومەوە سوعبەت، گوتم: کاکی دامرچی، سەگی ئەم خەڵکە بۆیە دەستیان بە حەپین کردووە، دەڵێن: ئەوە سەگێکی غەریب و تازە هاتووەتە ئەو مەنتیقەیە، ئەم ئاواز و نەوای ئەم ئەغاااامەیان بەلاوە تازەیە، لایان حەپەیەکی نامۆیە، هەر بۆیەشە لە حەپە ناکەون. هەموو دەستمان بە پێکەنین کرد، خۆیشی بە ڕووێکی تێکەڵ بە غەم کردییە قاقا. دەستمان کردەوە بە خواردنەوە. موعتەسەم ڕووی لێنام: ئەرێ تۆش جاران ناوە ناوە حەیرانت بۆ دەگوتین، ئەوە خێرە خۆت کڕ کردووە؟ بۆ دڵدانەوە و خۆشیی بینین و بەڕێکردنی موعتەسەم، نەمویست بێدڵیی بکەم، بۆیە دەستم بە حەیران گوتن کرد:

حەیراااااان
گەوارەکی دامەزراند لە دەشتی قەراجێ
تەڕ دەکا ئاقارێ مەخمووری
تەڕ دەکا گومبەتی برایماغای
کەرکێ حوسێنی غازی
سەرێ بێژینگ بەسەری

دەپەڕییەوە لە کەڕکێ کاولە تیماری
ڕەت دەبوو لە زوورگەزراوی
تەڕ دەکا بناری ئەنگرۆزی... ئاااااای ئایاااااای
لەبۆت نەمایمممممم.

لەگەڵ هەر هەڵسان و ئاااای و حەیرانێکدا، تێکڕای سەگ دەکەوتنە حەپین، لەبەر سەگوەڕ ئەو ناوە دەبووە حەپەحەپ و هەرا و خەڵکەکە یەکەمجاریان بوو ئەم بەزمە لە دەو ئاوەکە ببینن، دیسانەوە هەموو لە هەموو تەماشایان دەکردین و نەیاندەزانی مەسەلە چییە!

موعتەسەم بە پێکەنینێکی تاڵەوە ڕووی تێکردم:

خۆ بینیت! سەگەکان ئەمجارەیان حەپەکەی تۆیان بەلاوە غەریب بوو و دیسانەوە هەر وایانزانی سەگی تازە هاتووەتە مەنتیقە. مەعتەسەم بە غەمبارییەکی شاراوەوە گوتی: کاکە گیان من لای خۆمەوە قەبووڵمە، خۆزگە سەگێکی زنجیر لەملی دەست پیرەژنێکی داڕزاوی ئێرە بووام، بەڵام ئەو ڕۆژەم نەدیبا بگەڕێمەوە کاولە مەفتەن.

ئەغاالم و هەڵسانەکەی، سەگەکانی ئەو دەوروبەرە، سەگەکانی ئەو خەڵکەی ئەوێ تێکڕا دەستیان بە حەپە حەپ کرد. هەر واقمان وڕما. لەناکاو موعتەسەم بێدەنگ دەبوو دەیگوتە من: ئەرێ ئەوە چی بووە؟ چ قەوماوە ئەم سەگوەڕە چییە؟ کاتی خۆیشی سوعبەت و قسە و جنێوی جۆراوجۆر لە نێوان من و موعتەسەم هەبوو، ئیتر بە هەلم زانی لەگەڵە بکەومەوە سوعبەت، گوتم: کاکی دامرچی، سەگی ئەم خەڵکە بۆیە دەستیان بە حەپین کردووە، دەڵێن: ئەوە سەگێکی غەریب و تازە هاتووەتە ئەو مەنتیقەیە، ئەم ئاواز و نەوای ئەم ئەغاالمەیان بەلاوە تازەیە، لایان حەپەیەکی نامۆیە، هەر بۆیەشە لە حەپە ناکەون. هەموو دەستمان بە پێکەنین کرد، خۆیشی بە ڕوویێکی تێکەڵ بە غەم کردییە قاقا. دەستمان کردەوە بە خواردنەوە. موعتەسەم ڕووی لێنام: ئەرێ تۆش جاران ناوە ناوە حەیرانت بۆ دەگوتین، ئەوە خێرە خۆت کڕ کردووە؟ بۆ دڵدانەوە و خۆشیی بینین و بەڕێکردنی موعتەسەم، نەمویست بێدڵیی بکەم، بۆیە دەستم بە حەیران گوتن کرد:

حەیراااااان
گەوارەکی دامەزراند لە دەشتی قەراجێ
تەڕ دەکا ئاقارێ مەخمووری
تەڕ دەکا گومبەتی برایماغای
کەڕکێ حوسێنی غازی
سەرێ بێژینگ بەسەری

دەپەڕییەوە لە کەڕکێ کاولە تیماری
ڕەت دەبوو لە زوورگەزراوی
تەڕ دەکا بناری ئەنگرۆزی... ئاااااای ئایاااااای
لەبۆت نەمایمممممم.

لەگەڵ هەر هەڵسان و ئاااای و حەیرانێکدا، تێکڕای سەگ دەکەوتنە حەپین، لەبەر سەگوەڕ ئەو ناوە دەبووە حەپەحەپ و هەرا و خەڵکەکە یەکەمجاریان بوو ئەم بەزمە لە دەو ئاوەکە ببینن، دیسانەوە هەموو لە هەموو تەماشایان دەکردین و نەیاندەزانی مەسەلە چییە!

موعتەسەم بە پێکەنینێکی تاڵەوە ڕووی تێکردم:

خۆ بینیت! سەگەکان ئەمجارەیان حەپەکەی تۆیان بەلاوە غەریب بوو و دیسانەوە هەر وایانزانی سەگی تازە هاتووەتە مەنتیقە. مەعتەسەم بە غەمبارییەکی شاراوەوە گوتی: کاکە گیان من لای خۆمەوە قەبووڵمە، خۆزگە سەگێکی زنجیر لەملی دەست پیرەژنێکی داڕزاوی ئێرە بووام، بەڵام ئەو ڕۆژەم نەدیبا بگەڕێمەوە کاولە مەفتەن.

# شەگە و بەگە

شاکر و بەکر نۆبەرەی یەک سکوزا بوون، جمک بوون و تا ڕاددەیەک لە شەکل و سیفات و بەدعەمەلییش پێکدەچوون، کە بەسەرپێ کەوتن، خەڵکی گەڕەک پێیان دەگوتن شاکرۆک و بەکرۆک، پاشان کە چوونە مەکتەب، لە دەرسان ئەوەندە کۆڵ و دەبەنگ بوون، هاوپۆلە هاروهاجەکانیان ناویاننان شەگە و بەگە. ساڵ ڕۆیی و ساڵ هات، شەگە کەوتە هەندەران، لەوێ کە هاتەوە گوایە لە سایکۆلۆجیا خوێندوویەتی، بەگەش ئەوکات خەریکی ڕاوە ماسی و کاروباری بازرگانی بوو، هەردووکیان پێشتر دەمودووی ئەدەبیات و خوێندنەوەیان هەبوو، شەوان کە دەچوونە بن جێ، پێشی نووستن دەستیان بە شەڕە شیعر دەکرد و خۆیشیان پێ شاعیری چاک و شتەکی گەورە بوو، لەڕاستیدا ماعیریش تەواو نەبوون!

چەند مانگێک بوو شەگە لە هەندەران هاتبووەوە، ئێوارەیەکیان گوتم با سەرێکی ئەم خزمانەم بدەم، لەمێژە نەمدیون. ماڵی ئەوان لە گەڕەکی کەنناسان بوو، پشت باخچەکەی، بەرانبەر خەستەخانە،

لە کۆڵانی عارەبانڕا بە پێ لێمدا بۆ ئەوێ. کە لە ماڵی شەگە و بەگەی بنعامم نزیک بوومەوە، قەرەباڵغییەکم بەدی کرد، نزیک کەوتمەوە، زەینم دا خۆ ئەوە شەگە و بەگەن بەشەڕ دێن، خەڵکی کۆڵانەکە هاتبوونە دیارێ، پرسیم: ئەم هەرایە چییە؟ گوتیان: ئەوە دوو بران بەشەڕ دێن، وەختێکم زانیی لە بەینی شەگە و بەگە خۆم بینییەوە، کە خراپ دادەڕسانە یەک، کوڕە نەکەن، کوڕە دەستم دامێنتان، کوڕە بۆ وا دەکەن؟ فایدەی نەبوو، مامۆژنە فاتۆکی دایکیشیان لەولاوە وەستابوو دەگریا، خۆم گەیاندێ، گوتم: مامۆژن ئەوە شەگە و بەگە لەسەر چی بەشەڕ دێن؟ گوتی: چما من دەزانم؟ خەڵک بە کوڕی خۆی خەنی بووە، لە بەخت ڕەشیی من زیاتر چی هەیە! ڕووم کردە شەگە، لێیم ڕاخوڕی، گوتم: شەگە ئەوە چ هەراتە کوڕە؟ بۆ ڕاناوەستی؟ باشە بۆ بەشەڕ دێن، چ قەوماوە؟ دەمەوێ بزانم لەسەر چی بەشەڕ دێن! شەگە دەیگوت: ئەو فەترەیەی من لە دەرەوە بووم، بەگە چووە بە کەیفی خۆی شیعری منی دزیوە و بە ناوی خۆی بڵاوی کردۆتەوە. سامگرتوو بووم، تێم ڕاخوڕین گوتم: بەڕاستی شەرمە بۆ ئێوە لەسەر شتی پڕوپووچ دەستتان ناوەتە خنخنۆکی یەکتر، خۆم و چەند جوامێرێکی دراوسێیان وەزعەکەمان هێور کردەوە و هەردووکیانمان کردنەوە ژوورەوە. مامۆژنە فاتۆکیش هەر هاواری دەکرد: خەڵک بە کوڕی خۆی خەنیی بووە، منیش

بیست و چوار سەعات خەریکی چەقەچەق و لێک کردنەوەیانم، مەگەر لە بەخت ڕەشیی من نەبێ، دەبێ ئەوان سایە بن بۆ من، کەچی ئەمە حاڵمانە. بەهەرحاڵ، خۆم و دەرودراوسێ، بە شێوەیەکی کاتی پێکمان هێنانەوە، ئێستا وادەم پێداون کە ئێوارەیەکی تر، خۆم و دەستەیەک لە مەکتەبی کۆمەڵایەتیی حیزب، بچین سوڵحێکی یەکجارییان لەنێواندا بکەین.

## فەرهەنگۆک و لێکدانەوەی وشە

ئەنگۆ: ئێوە، هون.
ئەسکوو: ئەسکوێ، کەوچکێکی سەر گەورەی کلک درێژە.
ئەحمەد تەبیب: کەسایەتی و پزیشکێکی میللیی ناوداری هەولێر و باوکی فوئاد ئەحمەدی گۆرانیبێژ بوو.
ئەگلەنجە: شایی و گۆڤەندی ژنهێنانی شارستانانی هەولێر کە تیایدا دەست دەکرا بە خواردنەوە.
ئەووەلباب: لە زمانی عارەبی وەرگیراوە، مانای باشترین جۆر یان باشترین بابەت دەدات.
ئیبۆ بەربەر: سەرتاش و یاریزانێکی ناوداری تۆپی پێ بوو لە هەولێر.
بووریی: ڕابردوو.
بنلەیلووکان: شوێنی یاری و لەیلووکسواریی منداڵان.
بڕکۆکە: بڕۆکەک، کەمۆکەیەک، بڕێکی زۆر کەم.
برۆ: ئەبرۆ.
بەرماوە: پاشماوە، ئەو خواردنەی لە پاش کەسێک دەمێنێتەوە کە دەیخوات.
بێزەوەر: بێلەزەت، قێزەون.

**بیچم:** چەهرە، ڕووخسار، لە ئەسڵدا تورکییە.
**پەقرەج:** سەتڵ.
**پریسکۆکە:** بچووککراوەی پریسکە و پریاسکە، بوخچەی بچکۆڵە.
**پێبلکە:** قالدرمە، قادرمە، پیپلیکان، پلیکانە، پەیژە.
**پاشملە:** قسەکردن لەبارەی کەسێک لە غیابی کە سە کە .
**پایین:** پێناو.
**پەلیک:** هەلووک.
**پیل:** قۆڵ. لە کوردەواریدا بە پاتریی وشکیش دەگوترێ پیل.
**تاتەشۆر:** بەردێک یان تەختەیەکی پانە لە مزگەوتەکاندا مردووی لەسەر دەشووری.
**تامگێل:** مەیلەو گێل، نیمچە گێل.
**تریان:** سەبەتە، سەبەتەی نان.
**تەبارە:** کێڵکەی دەغڵودان کە کاتی دروێنەی هاتبێ.
**تەپشوو:** تەپشووێ، تەشووێ.
**تەپشوولانی:** تەشوولانی.
**تەمبێ:** تەنبێ، لە تەنبیهی عارەبییەوە کوردێنراوە.
**تەنێ:** هیس، ڕەشایی دیوی دەرەوەی مەنجەڵ بە دووکەڵێ.
**ترسێکەم:** دەترسم.
**تێلم کرد:** تەلەفۆنم کرد.
**تیووب:** وشەیەکی ئینگلیزییە مانای لوولە دەدات.
**تیژاژۆ:** تیژ لێخوڕین، تیژ هاژوان.
**تازەکانە:** ئێستاکانە، تێستاکێ، ئێستا.

تەنتریۆ: تەنتریۆک، یۆد.
تەما: نیاز، هیوا.
تفاق: تەبا، تەباوڕەبا، لە ئیتیفاقی عەرەبییەوە کوردێنراوە. (لەناوچەی پشدەر بە ئالیکی داکراوی مەڕ و ماڵات دەگوترێ تفاق)
جێوبالینگان: نوێن، شوێنی نووستن.
جەمالسێوان: وشەیەکی تورکییە، بەو پیاوانە دەگوترێ کە حەز لە کوڕی جوان دەکەن.
جام: تاسی ئاو یان هەر خواردنەوەیەک، لە زمانی کوردیدا بە شووشەی پەنجەرە هەروەها بە بادەیش دەگوترێت.
جۆڕک: تووڕەگەی قوماشی بۆ جۆ دروست کراو.
چەپرچاخ: کێردی گەورەی قەسابان.
چەرموو: سپی.
چەهرە: بیچم، ڕووخسار.
حالۆری: جۆرە بەرانێکە لەکاتی مەڕ بەبەران هاتن، تێر نابێت و لەو مێگەل بۆ ئەو مێگەل غارەغاریەتی.
چوغڵ: شکات و سکاڵا لێکردن.
حکوومەتن: حکوومەتەکەمان.
حەشتەبا: هیچ شتێک.
خرت: خڕوخەپان.
خڕ: هەموو، سەرجەم، بۆ نموونە: کورد خڕ ئازان.
خۆی خێواندە: خۆی گەیاندە، چوونە لا.
خنخنۆک: بەربین، قورقوڕاگە.
خمچی: خمگەر، ئەو کەسەی خام و بەن ڕەنگ دەکات.
خڕنووک: خەڕنووک، ڕووەکێکی سروشتییە، بەرێکی

خڕ دەگرێ، کە بەرەکەی وشک بووەوە پێی دەڵێن مەحچەچە.

**خرابابەت:** جۆری خراپ، بابەتی خراپ.

**دانوو:** دانوولە.

**داکەلان:** داکەلاندن، داکەندن.

**دەمنی:** دەڵێی، وەکوو، هەروەک.

**دەرو:** دەرگا، دەرکە.

**دەوە خاکەناز:** دەمە بێڵ.

**دەمچەفت:** هەڵەوەڕ، دەمچەوت، هەڵەگۆ.

**دەمانخێوێنتێ:** دەمانسرەوێنتێ، دەسرەوێنێتە ئێمە، لێماندەدات.

**ڕێست هاوس:** ئوتێل و شوێنی حەوانەوەی میوانان بوو لە هەولێر، لە سەردەمی ئینگلیز دروست کراوە، ئێستاش بەشێکی ماوە.

**ڕسکان:** فراژوو، ڕووان، دروستبوونی سروشتی.

**ڕدێن:** ڕیش.

**ڕووپییە:** حەفتا و پێنج فلسی سەردەمی ڕژێمی پاشایەتی بوو لە عیراق.

**زرمەزڕتە:** زرمەزلێ، مل لەبەریەکنان.

**زوورگ:** تەپۆلکەی ڕووت لە دەشت.

**زرۆقی:** مەیلەو شین.

**زەمتە:** زەغەڵ، تەنبەڵ.

**سەروپۆتەلاک:** سەروگوێلاک، سەروسەکوت.

**سیف:** کۆگای گەورەی داکردنی دانەوێڵە و کەلوپەل.

**سۆتن:** سووتان.

**سفت:** لووس و لێک.

**شارستان:** شارستێن، شارنشین، دێماتی، خەڵکی شار، پێچەوانەی لادێیی.

**شەمشوون:** پاڵەوانێکی بەهێز و کەسایەتیی ئەفسانەیییە، پاڵەوانێکی میللیی جوولەکان بووە لە کۆندا.

**شەستی:** شەقامی شەست مەتری لە هەولێر.

**شۆخی:** گاڵتەجاڕی.

**شقلیپقلی:** خەتی ناخۆش و تێکەڵوپێکەڵ کە بەزەحمەت دەخوێندرێتەوە.

**شینگ:** تاقەت، توانا.

**شلوکوت:** هیلاک و ماندوو.

**شینکەڵە:** مەیلەو شین، شینباو.

**عالەموڵلا:** خەڵکی ڕەشۆک، ڕەشەخەڵکی سادە.

**عەمبارەسۆت:** عەمبارەپۆ، ئەمبارەسۆت، بەو قوماشە دەگوترا کە لە ئەمبار و کۆگاکان زۆر دەمایەوە و گەرمی دەیسووتاند و بە ئاسانی دەدڕا.

**عەممۆ:** زاراوەیەکە وەک ئەتەکێت و ڕێزگرتن، هەندێ لە لاوانی ئێستای ناو شار بۆ کەسانی لە خۆیان گەورەتر بەکاری دێنن.

**غەوارە:** غەریبە، بێگانە.

**غەشیم:** کۆڵەوار، لە غاشم ی عەرەبییەوە هاتووە.

**فێس:** جۆرە کڵاوێکی درێژۆکانی بوو جاران پیاوان لە سەریان دەنا.

**فلیم:** فیلم.

**فلێس:** پولەکی، قرچۆک، ڕەزیل.

**فویلپەم:** پارچەیەکی ئۆتۆمبیلە لە بازاڕ و ناو فیتەران پێیدەڵێن فیتپەم.

**قاپقاپ:** کەوشی دەمپێیی کە بنەکەی دارە.

**قادرمە:** قاڵدرمە، پێپلیکان، پێبلکە، پلیکانە، پەیژە.

**قل:** دەنک، دانە.

**قەمپار:** قەپ لێدان، گاز گرتن، گەززە.

**قوژبن:** قولینچک، سووچ.

**قوتەبنە:** شەمووڵە، کورتەباڵا، کورتەبنە.

**قایدە:** قاعیدە، ڕێسا.

**قولینچک:** قوژبن، سووچ.

**کندر:** پەت، گوریس.

**کوندە:** مەشکە، مەشکۆڵە، پێستی گووراوی گا و مانگا و بزن. ئاوی تێدەکرێت.

**کووللوبابەت:** هەموو شتێک، (بە هیچ کوللوبابەتێک: بە هیچ جۆرێک).

**کەتە:** گەورە و بەخۆوە.

**کەلەش:** جەستە، لەش.

**کەلکەلە:** خولیا، خەیاڵ.

**کەدینە:** کووپەی ئاو خواردنەوە، گڵێنە، شەربە.

**کۆترۆکە:** لەرزانە، دەرزیلەیەکی سەر بە پنتێک شووشەی خڕە، چەند ڕەنگێکی هەیە، ژنان بۆ جوانی لە کڵاو و بەرۆکی خۆیان دەدا.

**کەرپووچ:** خشتی سوور.

**کندڕ:** پەت

**کیمیک:** کیمیا.

**کەوگیر:** کەفگیر.

**گڵکەند:** باخچەیەکی گەورەی هەولێرە لە شەستەکانی ڕابردوو دروست کراوە.

**گوڕاح:** خۆشی.

**گروازە:** قژی لوول.

**گۆلم:** پڕ بە ناولەپ.

**لووشکە:** لەقەی کەر.

**لەندەهۆر:** زەبەلاح.

**ماجەڕا:** بەسەرهات، لە (ما جری)ی عارەبییەوە هاتووە.

**مشوهۆڕ:** مشەمشی لووت.

**مەرگەمووش:** شەیەکی فارسییە یانی مردنی مشک یان مەرگەمشک.

**مووچکە:** وردەموو، تووک.

**مفت:** موفت، بەلاش، خۆڕایی.

**مێریڤان:** میهرەبان.

**ناگەهان:** کتوپڕ.

**نۆبەتدار:** پاسەوان.

**نەتر:** لەتر.

**نووردیەنان:** لە سێ هەتا دە نان پێی دەگوترێ نووردیەنان یان نۆردووەنان کە بریتییە لە نانی تیریی یان نانی ساج.

**وەرمدەگەڕایێ:** لێیدەدام.

**وەرسووڕان:** بادانەوە.

**وەمدەڵێتەوە:** پێمدەڵێتەوە.

**هووردکە:** وردکە.

**هەنگران:** پیاهەڵشاخان.

هەورەبـــان: بانێـژە، بەیتوونـــە، نیمچـــە ژووری ســـەربان بـۆ کەلوپـەل.
هۆپەکـــم لەخـــۆم زانـــی: تووشـــی شـــۆک هاتـــم، ســـەرم ســـوڕما.
هۆقە: دووازدە کیلۆغرامە.
هەراسان: جاڕس، وەڕس.
هەیوان: تارمە.
هیتوهۆڕ: حیتوهوڕ، قاقای پێکەنین، حیتە حیت.
هەنیە: نێوچەوان، ئەنیە.
هێروە: بەملاوە.

ناوەرۆک